

# باوکانی سەلەفییەت

## دەروازەیەک بۆ سەلەفیناسی

محەمەد هەریری

چاپی یەکەم 2017

# پێشەکی

ئەو بابەتانە لە شێوەی لێکۆڵینەوە بۆ گۆڤار و ڕۆژنامە و ماڵپەڕەکان نووسراون، لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٥ تا ٢٠١٧. دەبوایە دەمێک با چاپ کرابایە لە دوو بەرگی کتێبێک، بەڵام لەبەر هەل ومەرجی گشتی گۆڕەپانی فەرهەنگی کوردی، و هەلومەرجی تایبەتی خۆم، نەمتوانیوە ئەو کارە زوو ئەنجام بدەم.
خۆزگە لە کوردستان خانەی چاپ وبڵاوکراوەکان لیژنەیەکی پسپۆری وریایان دەبوو، ئاگاداری هەلومەرجی فەرهەنگی و بیروڕا و ئاڕاستەکانی خوێنەرانیش دەبوون، بۆ ئەوەی بزانن چ کتێبێک پێویستی بە چاپ کردنە وکامەشیان گوناهە کاغەزی تێدا بەخەسار بدرێت! بەڵکو ئەرک و خەمی چاپکردنی ئەو کتێبانەیان لە کۆڵ من و هەر نووسەرێکی جیدی دەکردەوە، نەک بیرکەیتەوە و بنووسیت و کاتت هەمووی ببەخشیت لەسەر حیسابی خۆت وماڵ و خێزانت، ئینجا خەمی ئەوەشت بێت چۆن چاپی بکەیت؟!
بەڕای من ترسناکی بیری سەلەفیەت لە پێش گەندەڵی و مەترسیە سیاسیەکاندایە، چونکە ئەو کاریگەرە تێکدەرەی سەلەفیەت لە بیرو بۆچوون و میزاج و ڕەوشت و کلتوری نەتەوەکەمان جێی دەهێڵێت، زۆر مەترسیدارترە لە کاریگەری نێگەتیڤی هەر حزبێک ودەسەڵاتێکی سیاسی.
من هەرزوو دەرکم بەوە کرد، بۆیە بە شانازیەوە دەڵێم لە کوردستانی عێراقدا، یەکەم کەسانێک بووم کە لەناو هەناوی ئیسلامی سیاسییەوە، بیری ترسناکی سەلەفیەتم دایە بەر نەشتەری ڕەخنە. ئەوەش کاردانەوەیەکی زۆری هێنا بەدوای خۆی لە هەڵچوون وجوێن وهەڕەشە و سکاڵا لە دژ تۆمارکردن و تا کۆتایی...
ئەو کاتە زۆر هەستم بە تەنیایی دەکرد، بەڵام ئێستا کە دەبینم دەیان و سەدانی وەک من، هاتوونەتە مەیدان بۆ بەرگرتن بەو بیرە مەترسیدارە، دەزانم کە ڕەنجمان بە خەسار نەچووە!
هەر میللەتێک نوخبەیەک پەیدا نەبێت بۆ هوشیارکردنەوەی خەڵک، بە مەترسیەکانی بیرە مەترسیدارەکانی لە شێوەی سەلەفیەت، پاش ماوەیەک کۆمەڵگا بەوپەڕی نێگەتیڤیەوە خۆی ڕادەستی ئەهریمەنی ئەو بیرانە دەکات، شەقامی وڵات تەسلیم بە

غەوغاییەکی دەبەنگی دینیی سەلەفی دڕندە دەبێت! بەتایبەتی ئەگەر دەسەلاتێکی بێ خەمی سەرقاڵ بە گەندەڵیت هەبێت! ئینجا جیابیرەکان لەسەر شەقامەکان وەک فەرخەندەی کابول و مەلالە ومەشعەل خانی پاکستان، وەک دڕندە هێرشیان دەکرێتە سەر بە دار وبلۆک و چەقۆ و شمشێر!

کۆمەڵگای پاکستانی وئەفغانی و سۆماڵی و سوری چەند نموونەیەکی باشن لەو بوارە. هیوادارم بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە قووڵتر وچاکتر لە بیری مەترسیداری سەلەفیەت تێبگەن، و دەوروبەریشتان ڕووناک کەنەوە بە هەر بیرۆکەیەکی باشی ناو کتێبەکە.

ئەو وتار و لێکۆڵینەوانە بەشێکن لەو نووسینانەی بەندە لەسەر ئەو دیاردەیە گرنگ و ترسناکەی سەلەفیەت، کە بە هەوڵ و کۆششی تاقە کەسی نوسەر کۆکراوەتەوە و ڕیزبەندی بابەتەکان کراوە لە دوو توێی ئەو کتێبە..

ئەو بەرهەمانە لە ئەنجامی تێکەڵبوونی کرداری لەگەڵ ئەدەبیات و جولانەوە ئیسلامیەکان هاتۆتە ئارا. یانی سەرەڕای ئەزموونی کرداری، ئەزموونێکی زۆری تیۆری و خوێندنەوە و بەدواداچوون بۆ وتار وکرداری سەلەفیەت و ئیسلامی سیاسی لە پشت بیروڕاکاندایە.

ئەو وتارانە لە ڕێگای ڕۆژنامە وسایتەکان پەیامی خۆیان گەیاندوە، لە کات و ڕۆژی جیا جیا نووسراون، و لە قۆناغی فیکری جیاواز نووسراون، بۆیە سەرەڕای یەکێتی ناوەڕۆکی، لەوانەیە جاروبار دوو ڕای تاڕادەیەک جیاواز لەسەر بابەتێک ببینرێت، بەلام مێژووی وتارەکان ئاماژە بۆ قۆناغە فیکریەکان دەکەن، چونکە مرۆڤ نابێت کائینێکی نەگۆڕ بێت! هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکم کردبێت بەو بوارە، تەنها ئامانجم خۆشبەختی وپێشکەوتنی میللەتەکەمە وهیچی تر...

محەمەد هەریری / لەندەن

٢٠١٧/٤/٢٢

# دەروازەیەك

سەلەفییەت شێوازێکە لە بیر کردنەوە زیاتر لەوەی مەزهەبێکی دینی ئیسلامی بێت، لە هەر دینێکی ئاسمانی وئەرزی بڕوانی ولە مێژووی وردبیتەوە کۆمەڵێک، گروپێک بچوک یان گەورە بەدی دەکەیت، کە هاوبەش بێت لە زۆربەی هەرە زۆری ڕەفتار وبۆچونەکانیان، کە دەکرێت ناوی بنێن سەلەفییەت، ئۆرسۆزۆکیەت، پیوریتانیەت، هتد... ڕاستە لە هەر دینێک ناوێکیان هەیە، بەڵام هەمووی لەیەک دەچن لە گوتار وکردار.
بەژداران لەو دیاردەیە هێندە لێک نزیکن ئەگەر هاتوو عینوان وناوەکانیان لێ هەڵگرین لەوانەیە کەس نەتوانێت لێکیان جیاکاتەوە، بەڵام بێگومان هەر یەک لەو گروپانە دیاردەی تایبەت بە خۆشیان هەیە. ئەگەر بمانەوێت چاوێک بخشێنین بە سیما گشتییەکانی ئەو گروپانە دەکرێت بڵێین زۆربەی زۆری ئەو گروپانە تەقدیسی مێژووی زووی دامەزرێنەرانی گروپەکانیان دەکەن، وتەقدیسی هەموو شتێکی کۆن دەکەن تا ڕادەی نەخۆشی. هەموو ئەو گروپانە تا ئەمڕۆ وهەموو کاتێک لەناو قۆزاغەی مێژوو دەژین ونایانەوێت لێی دەرچن، چونکە بەرگەی تەعقیداتی ژیانی نویێ ناگرن.
وئەو پەیامەی پێیانە ناتوانێت چارەسەری گیروگرفتەکانی ئەو سەردەمە بکات، بۆیە شەڕی مان ونەمان دەکەن لە پێناو مانەویان لەناو قۆزاغەی مێژوو، ،ئەویێ بە چاکترین شوێن دەزانن بۆ ژیان وئارامی دل، چونکە هەموو کێشەکانیان لەویێ چارەسەرێکی هەیە، وبەبیێ بیرکردنەوە یان موعاناتی بیرکردنەوە هەموو کێشەکانیان لەلایەن بەراییەکان یان پێشینەی سالح ( سەلەفی سالح) چارەسەر کراوە، چونکە ئێمەی (خەلەفی تالح) هەرچەندە هەولبدەین وبیرکەینەوە ناگەینە ئاستی کەوشەکانی ئەوان، کەوابوو بۆ بیر بکەینەوە ئەگەر ئەوان بیریان کردبێتەوە؟!
بۆ ئێمە سەلامەتترە شوێن کەوتووی ئەوان بین نەک قسە بکەین بەڕای خۆمان لەسەر ئایین!! هەموو قسە وگوتنەکانی پیاوە ناودارە چاکەکانی ئەو سەردەمە – وەک سەلەفی سالح – وەک شەرع ویاسا وبیێ گفتوگۆ لەسەر کردن وەردەگرن، ئەوان چاکتر وپاکتر وبەتەقواتر وپیرۆزترن ولەهەمووی

سـەیرتر زاناتریشـن! عەقـل ورِا هـەردەم تاوانبـارن لـەلای ئـەو گروپـە سـەلەفیانە تـا ئـەو رِادەیـەی لـە سـەلەفییەتی ئیسـلامی عەقـل دەبێتـە موورادیفـی شـەیتان. زۆربـەی ئـەو گروپانـەی سـەلەفییەت دژی هـەر بیرورِایەکـی تـازەن، حـەز دەکـەن هـەردەم دروشـمی (لیس فـی الامـکان احسـن ممـا کان: واتـە لـەوەی هەبـوە چاکتـر نایەتـەوە) دووبـارە بکەنـەوە.

ئەو گروپانـە بـە شـێوەیەکی زۆر وشـک پەیرِەو نـەک لـە دەقـە پیرۆزەکانیـان دەکـەن، بەڵکو پەیرِەو لـە تەفسیرکردن ولێکدانـەوە کۆنەکانی سـەردەمی زێرِینی دەقەکانیش دەکـەن لـە رِێگای گەلێک شـێواز ومیکانیزمـی جیاجیـادا، تـا ئـەو رِادەیـەی حـەدیسـی زەعیف ومەوزوعیشـیان پێ چاکترە لـە بیرورِایـەک.

زۆربـەی هـەرە زۆری ئـەو گروپانـە زۆر بـە هەڵپـەن بۆ کافرکردنی هەمـوو خەڵکانی تـری نـاو خـودی دینەکـەی خۆیـان، بەڵکـو بازنـەی موخالیـف ونەیـارەکان هێنـدە فـراوان دەکـەن، تـا دەگاتـە ئـەوەی زۆربـەی کەسـەکانی نـاو گروپەکـەی خۆشـیان تەکفیـر بکـەن، بـە هـۆ وبیانـووی زۆر سـەیر وسـەمەرە.

تـا وای لێدێـت ئەمیرێـک وچەنـد کەسـێک دەبنـە (فیرقـەی ناجییـە) (گروپـی رِزگار بـوو)! تەکفیـر کردنـی ئەوانـە پـەل دەهـاوێژێ بـۆ زانـا وئیمامـە ناودارەکانیـش، بـۆ نموونـە یەکێکـی وەک ئیمـام ئەبـو حەنیفـە، کـە زۆربـەی موسـڵمانانی جیهـان پەیرِەو لە مەزهەبـی ئەو دەکـەن، دەیـان جـار، بەڵکو سـەدان جار تەکفیر دەکرێت وبـە شـەیتان بـەراورد دەکرێـت، ودرۆی شـاخداری بـۆ هەڵدەبەسـترێت لـە کتێبـە حەدیسـی و مێژوویی وعەقیدەییەکانی سـەلەفیەکان، تەنها خۆیـان فیرقـەی ناجیـەن، خەڵکیـش هەمـووی بـەورد ودرشـتیان دەچنـە ئاگـری دۆزەخ، تـا ئـەو فیرقـە ناجیـە (گروپـە رِزگاربوە) بـە تەنهـا وبەبێ سـەخڵەت کردن لەلایـەن خەڵکانی تر بچێتـە ئەو بەهەشـتە پـان وبەرینـەی کـە لـە قورئـان هاتـووە بەقـەد گەورەیـی ئـەرز وئاسـمان بەرینـە!!

بێگومـان ئـەو بیروبـاوەرِەش لـە ئەنجامـی بیرۆکـەی پاوانکردنـی هەقیقـەت دێتـە کایەوە، چونکـە هەمـوو زانایانی مەزهەبەکانی تر لادەر وگومرِاکـەرن وهیچیـان پێ نیـە، ونابێتـە زانایەکی رِیزدار لەلایان تا نەیەتە سـەر مەزهەبەکەی ئەوان، بۆ نمونە بروانـە خیتابـی سـەلەفی دەربـارەی ئیمـام ئەبـو لحەسـەنی ئەشـعەری (٢٦٠ – ٣٢٤ هـ) لەسـەردەمی بنیاتنانـی مەزهەبـی ئەشـعەریەت و (گوایـە) پـاش پاشـگەزبوونەوەی ونوسـینی کتێبـی (الابانـة عـن اصـول الديانـة) کـە زیاتـر لـە کتێبێکـی هەڵبەسـتراو بـە

دەمی ئەشعەری دەچێت!!.
هەر لە ئەنجامی ئەو بیروڕایانە تێڕوانینێکی زۆر سوک وبێ نرخانەیان لەلا دروست دەبێت بۆ هەرکەسێکی دەرەوەی بازنەی خۆیان، تا دەگاتە خوێن حەڵاڵ کردنیان، بۆیە دەبینین چۆن ئەو گروپە سەلەفیانە بەو پەڕی هێمنی وئاسودەییەوە تاوانەکانیان ئەنجام دەدەن لە دژی نەیارەکانیان هەتا لەوانەی کە شەڕیشیان لەگەل ناکەن، بەڵکو زۆرجاران لە دژی ئەوانەی سەر بەهەمان قوتابخانەی فیکری ئەوانن!!

## سەلەفییەت چییە؟

کێشەی سەلەفییەت ئەوەیە، دەیەوێت خۆی چ پێناسەیەکی داناوە بۆ خۆی، خەڵکیش بە هەمان پێوەر بۆی بپیوێت و پێناسەی بکات! ئەوەش ئەگەر وابێت، ناتوانرێت ڕەخنە لە هیچ گروپ و هیچ حزب و کۆمەڵێک بگیرێت، بۆ نموونە وەرە پیناسەی حزبی بەعس بخوێنەوە بۆ خۆیان، وەرە گوێبگرە لە فەلسەفەی بەعس، یان پێناسەی قاعیدە و باقی توندڕەوەکان، یان نازیزم و هەتا فاشیزم بخوێنەوە، بزانە خۆیان چۆن وەسفی خۆیان و ستایشی ڕۆڵی گرنگی خۆیان دەکەن، چۆن باسی زەرورەتی بیروڕاکانیان دەکەن بۆ مرۆڤایەتی و جیهان! کەچی خەڵک کە کردەوەکانیان دەبینن دەزانن، ئەوانە ڕاست ناکەن لەگەڵ خودی پێناسەکانیان، و سەرەڕای بوونی تێڕوانینی پڕ لە کەموکوڕی لەناو پێناسەکان و جیهان بینیان.
ئەگەر بێینە سەر پێناسەی سەلەفییەت، کە دەڵێن: سەلەفییەت مەنهەجی ڕۆیشتنە لەسەر ڕێگای ڕاستی ئیسلام، بەپێی کیتاب و سونە، کاتێک تێگەیشتنەکان جیاواز دەبن بۆ تەفسیر و ئەحکام ئیسلام و دیاریکردنی مەنهەجیەتی ڕاست، لەو کاتەدا سەلەفییەت دێت بە پشتبەستن بە مەنهەجی سەلەف و سەحابە و شوێنکەوتەکان و شوێنکەوتەی شوێنکەوتەکان،کە بە پێی سەلەفییەت چاکترین و عاقڵترینی ئەو ئومەتەن، و پایەدارترین و زاناترینیانن، و قوڵترین تێگەیشتنیشیان هەیە بۆ ئیسلام، و زاناترین کەسن بە کار و کردوەکانی پێغەمبەر [د.خ] ڕێگامان نیشان دەدەن!! ئەوەی شوێنی ئەوانە کەوت سەلەفیە لەهەر شوێنێک و گروپێک بێت. بێگومان کە دێن بەو شێوەیە وەسفی خۆیان دەکەن، خەڵکێکی زۆر لەوانەی بێ ئاگان

لـە مێژوو و لـە زانسـتەکانی ئیسـلامدا، بـە پاڵنەرێکی عاتیفی و دینی پێیـان بـاوەڕ دەکـەن، بێ ئـەوەی هیـچ کەموکورتیـەک هەتـا لـە خـودی پێناسـەکە ببینێت.
بـەڵام کـە سـەلەفییەت لەلایـەن خەڵکانـی دینـدار و موسـڵمانانی تـری دەرەوەی ئـەو بازنەیـە دەڕوانێتـە کار و کـردەوە و تێگەیشـتنی سـەلەفیەکان پێناسـەی تریـان بـۆ دەکـەن کـە بگونجێت لەگـەڵ واقیعی حاڵیان،نـەک ئـەوەی بەخۆیان دەڵێن دەربارەی خۆیان،چونکـە وەک کـورد دەڵێت کـەس بـەدۆی خـۆی ناڵێت ترشـە!
سـەلەفییەت زیاتـر چەمکیکـی زەمەنـی و دەروونیـە، بەرلـەوەی شـەرعی بێـت. لـە ڕووی زەمەنـی و کاتـەوە هـەر نەوەیـەک بـە دوای نەوەیەکـی ترهـات، ئـەوە بـە شـێوەیەکی حەتمـی ئەوانـەی پێشـوو دەبنـە سـەلەف و بەرابییەکانـی، ئەوانـی دواتـر بەپێـی ڕەوتـی زەمەنـی، ئـەوەش هیـچ هونەرێکـی بـۆ کـەس تێدا نیـە، بەڵکـو یاسـای سروشـتی بەڕێوەبردنـی بونـەوەرە.
لـە ڕووی دەروونیـەوەش، هەمـوو توێژینـەوە ئەنترۆپۆلیژیـەکان دەیسـەلمێنن کـە هەسـتێکی زۆر بـە هێـز هەیـە لای مرۆڤـە سـەرەتاییەکان، وتاڕادەیـەک مـرۆڤ بـە گشـتی بۆ بـە پیرۆز زانیین و گەورەکـردن و بەڵکـو پەرسـتنی سـەلەف و بەرابییەکانی خۆیـان. و ئایینەکانـی بەرابیپەرسـتی [عبـادة الاسـلاف] یـان پەرسـتنی پێشـینان لـە جیهانـدا زۆر بەربـڵاوە، و تـا ئێسـتاش بەردەوامـە.

## سەلەف لە قورئاندا

بێگومـان لـە سـایەی شۆڕشـی مەعریفـی و پیشـکەوتنی تەکنۆلـۆژی لەوانەیـە ئـەو هەسـتە بەرەو پوکانـەوە و چونـەوە قەبـارەی سروشـتی خـۆی بچێـت، بـەڵام لـە نـاو مەدرەسـەی سـەلەفییەتی نصوصـي، دەقگـەراکان ئـەو ئاڕاسـتەیە تـا دێـت بەهێزتـر دەبێت لەبـەر مەنهەجیەتـی رەفتارکردنیـان لەگـەڵ دەق دا. زاراوەی [السلف] وەک ناو لـە هیـچ ئایەتێکـی قورئـان نەهاتـوە بـەو چەمکـەی کـە سـەلەفییەت تێیدەگـەن، بەڵکـو جارێـک [سـلفا ] هاتـوە ئەویـش لـە سـیاقی سـەرکۆنەکردن نـەک سـتایش کـردن کـە لـە سـورەی الزخـرف دەفەرموێـت: [ فَجَعَلْنَاهُمْ سَلَفاً وَمَثَلاً لِلْآخِرِين [ الزخـرف : ٥٦.
لـە پێنـج ئایەتـی تـر فعـل و کـردەی [سـلف] هاتـوە، کـە ئەویـش لـە سـیاقی ستایشـکردنەوە نەهاتـوە، بەڵکـو لـە سـیاقی لیخۆشـبوون لـە گوناهـی بەرایـی دا هاتـوە،

ئەگەر واز لە کردەوە خراپەکە بهێنێت وەک: «وَلاَ تَنكِحُواْ مَا نَكَحَ آبَاؤُكُم مِّنَ النِّسَاء إِلاَّ مَا قَدْ سَلَفَ [النساء : ٢٢]“ یان وەک لە سورەتی البقرة دا هاتوە: [ وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا فَمَن جَاءهُ مَوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّهِ فَانتَهَىَ فَلَهُ مَا سَلَفَ وَأَمْرُهُ إِلَى اللّهِ ... ] البقرة : ٢٧٥.

## سەلەف لە سونەدا

لە سونەتیشدا تەنها یەک دوو ڕیوایەت هەیە کە ئەویش ئاماژە بەو چەمکە ناکات، لە بوخاری و مسلم هاتوە کاتی پێغەمبەر [دخ] بە فاتیمەی کچی دەڵێت: لە لەفزی موسلیم دا: «وَلَا أُرَانِي إِلَّا قَدْ حَضَرَ أَجَلِي وَإِنَّكِ أَوَّلُ أَهْلِي لُحُوقًا بِي وَنِعْمَ السَّلَفُ أَنَا لَكِ» واتە وابزانم ئەجەلم نزیک بوە، وتۆ یەکەم کەسی لە کەسوکارم دەگەیتە لای من ومن چاکترین بەراییم بۆ تۆ! ئەو فەرمودەیەش باس لە حالەتێکی شەخسی دەکات و دڵنەوایی باوکێکە بۆ کچەکەی کە خەم نەخوات لە مردنی باوکی چونکە ڕاستە من پێشی تۆ لەو کاسە دەنۆشم، بەڵام تۆ یەکەم کەسی بەدوامەوە دێیت لەکەس و کارانم و من چاکترین نمونە و بەراییم بۆ تۆ.

## دەزانن پێغەمبەریش سەلەفی ساڵحی هەبوو!

لە حەدیسێکی مسندی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و ترمذی و سەرچاوەی تریشدا، هەرچەندە بەناوی ئیبراهم و زینب و رقیەی منداڵانی پیغەمبەر هاتوە، دیاری دەدات کە مەبەست لە سەلەفی ساڵح هەرکەسێکی باشە کە پێش کەسێکی تر بمرێت، ئەگەرنا چۆن دەبێت سەحابیەک ببێتە سەلەفی ساڵحی خودی پێغەمبەر. ئەگەر سەلەفی ساڵح پایەکی مەعنەوی وا گەورە بێت، ئەوە دەبێت پێغەمبەر سەلەفی ساڵحی سەحابە و هەموو موسڵمانانی تربێت، نەک بە پێچەوانەوە سەحابیەک ببیتە سەلەفی ساڵحی پیغەمبەر!! کاتێک یەکێک لە مناڵەکانی وەفات دەکات [جا ئیبراهم و زینب و رقیە هەرکامەیان بێت] پێغەمبەر لە ئافرەتێک تورە

دەبێت کاتێ دەڵێت: پیرۆزت بێت بە هەشت ئەی عثمان بن مظعون، و پێی دەڵێت: تۆ چوزانی دەچێتە بەهەشت؟! ژنەکەش دەڵێت: عوسمان سوارچاک و هاوەڵی تۆ بوو، پێغەمبەر گووتی: وەڵلاهی من پێغەمبەری خوام نازانم چێم لێدەکرێت! خەڵک بەزەییان بە عثمان دا هاتەوە،بۆیە کاتێک زەینەبی کچی پێغەمبەر وەفات دەکات، پێغەمبەر دەفەرموێت: برۆ بگە بە سەلەفی ساڵح و خێرخوازمان عثمان بن مظعون..! " لما مات عثمان بن مظعون قالت امرأة : هنيئا لک الجنة عثمان بن مظعون فنظر رسول الله صلى الله عليه وسلم إليها نظر غضبان فقال : وما يدريک قالت : يا رسول الله فارسک وصاحبک فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : والله إني رسول الله وما أدري ما يفعل بي، فأشفق الناس على عثمان فلما ماتت زينب ابنة رسول الله صلى الله عليه وسلم قال رسول الله صلى الله عليه وسلم : الحقي بسلفنا الصالح الخير عثمان بن مظعون الراوي: عبدالله بن عباس المحدث: أحمد شاكر - المصدر: مسند أحمد -خلاصة حكم المحدث: إسناده صحيح" کەوابوو عثمان یش سەلەفی ساڵحی پێغەمبەر بوو!

ئەو تیۆرەی سەلەفی ساڵح هەر بەو حەدیسە هەڵدەوەشێتەوە و دەیسەلمێنێت، سەلەفییەت پایەکی مەعنەوی نییە، زیاتر زەمەنییە.

ئەوەی تر لە ڕیوایەتەکانی دوایی سێ نەوەکەی یەکەم کە دەڵێن، کان السلف کذا وکذا، هەمووی لەسەر زمانی خلف هاتوە تەنها ریوایەتێکی ابن عباسی لێدەرچێت کە شوێەواری وضع و هەڵبەستنی پێوە دیارە. ئەو هەستە بە گەورەیی سەلەف وپیرۆزی لە سەردەمی خودی سەلەفەکان یان بەراییەکان وا تۆخ نەبوو، هەتا ئەگەر گوزارشیشی لێکرابێت، وا بەو تێڕوانینە پاوانخوازیەی سەلەفییەتی سەردەم نەبووە، لە دیاریکردنی ڕێوشوێنیکی زۆر وتەسک بین بۆ هەرکەسێک بیەوێت بیربکاتەوە، دەبێت بەپێی پێوەری ئەوان بیربکاتەوە. ئینجا بە نسبەت ئەوەی کە سەحابە وتابعی وتابعی تابیعیەکان چاکترینی ئەو ئومەتن، لەوانەیە بۆمان هەرس بکرێت، بەڵام زیرەکترین و قوڵترین تێگەیشتن لە دەقەکانی ئیسلام لەلایەن ئەوانەوە بێت، ئەوە نە مێژوو، و نەواقیع ئەو قسەیە دەسەلمێنێت، زۆرجار هەبوە تابیعی زۆر لە صەحابە زاناتر بوە و فەتوای بۆ داوە، هەبوە لە زانایان زۆر لە تابیعی و تابیعی تابیعیەکانیش زیرەکتر بوون، سەحابی هەبوە سورەتە کورتەکانیشی بەڕەوانی لەبەر نەبوە! ناکرێت ئەو قورئانە هەمووی ببەسترێتەوە بە فەهمی سێ جیل و نەوە، وتا رۆژی قیامەت کەس نەتوانێت تێگەیشتنێکی تری لی هەڵەنجێت،

ئایە ئەوە ئەو قورئانەیە کە وەسف دەکرێت لە حەدیسدا کە [لا تنقضي عجائبه] شتە سەیروسەرسوڕهێنەرەکانی بە کۆتا نایەن!

## مێژووی دەرکەوتنی سەلەفییەت

سەلەفییەت لە سەردەمی ئومەویەکانەوە نەشونمای دەکرد، بەڵام یەکەم دەرکەوتنی ڕەسمی سەلەفییەت لە سەردەمی عەباسیەکان بوو، وەک کاردانەوەیەکی ڕەشۆکی وعەوامیانە، لە دژی مەنهەجی ئەوانەی ڕێزیان بۆ عەقڵ دانا بەرامبەر چیایەک لە نەقلی زۆروبۆر، چونکە لەسایەی هەڵئاوسانی نەقڵ و زەبەلاح بوونی بە درۆ وهەڵبەستن بە دەمی پێغەمبەر، ئەشعەری و ماتوریدیەکان ویستیان تا بکرێت پشت بە بەڵگەی موتەواتر وقورئان وعەقڵ ببەستن، نەک هەر دەقێکی ئاحاد بکەنە حەکەم لە خوێن و دامێن و حەلاڵ وحەرامدا.

## دامەزرێنەری سەلەفییەت

دەتوانین بڵێین دامەزرێنەری یەکەمی سەلەفییەت ئەحمەدی کوڕی حەنبەل [١٦٤ -٢٤١ هیجری] کە وەک کاردانەوەیەک بەرامبەر کرانەوەی جیهانی ئیسلامدا بەسەر جیهان و زانستی خەڵکانی تر و بزوتنەوەی وەرگێڕان، ترسێک لەناو خەڵکی عەوام نیشت لەبەر نەتوانینی تێگەیشتن و ئیستیعاب کردنی ئەوەی دەگوزەرێت، بۆیە ئەهلی حەدیس کەوتنە خۆ بۆ کۆکردنەوەی ڕیوایات و حەدیسەکان بەڕاست و هەڵبەستراوەوە، و هەر لەسەرەتادا زیاتر گوزارشیان لە ترس و نیگەرانی و ڕوحی خەڵکی ڕەشۆکی دەکرد. ئەوەی لە ئەدەبیاتی ئیسلامیدا پێیان دەڵێن عەوام.

وتاری دینی هەردەم گەلێری و شەعبی بووە، بەڵام تا ئەمڕۆش بەڕای من سەلەفییەت لە هەموو مەدارسەکانی تری ئیسلامی زیاتر، موخاتەبەی عەقڵی عەوام دەکات، و توانایەکی زۆری وروژاندنیانی هەیە، بەو وتارە عاتیفی وویژدانیەی کە هەیەتی. ئەوانە لە سەرەتادا ناونران بە قوتابخانەی [ئەهلی حەدیس] کە ئەو ناوە

ڕاستره لـه نـاوی سـەلەفییەت یـان اهـل السـنه والجماعـه. ئەوانـه ئـەو قوتابخانەیـه دەقگـەرا [نصوصیـه] بـوون کـه دژی بەکارهێنانـی ڕاو و عەقـڵ وقیـاس وتەئویـل بـوون بـۆ تێگەیشـتنی دەقـەکان، بەڵکو لەبەرامبـەر دەقەکانیـش تـا پێیـان کرابێـت لـه ڕوکەشـی دەقەکانـەوە وەسـتاون، و عەقڵیـان بـەکار نەهێنـاوە.

هەتـا لـه کاتـی بوونـی دوو حەدیسـی جیـاواز نەهاتـوون بـه عەقـڵ ترجیحـی یـان پەسـندی یەکێکیـان بـدەن بەسـەر ئـەوەی تـر، بەڵکـو هـەردوو ڕایەکەیـان تەبەنـا کـردوە! بەڵکـو لـه حاڵەتـی وجـودی حەدیسـێکی زەعیـف و مورسەلیشـدا هـەر نـه قیاس و نـه عەقڵی وەرنەگرتوە، یانی حەدیسکی زەعیف، کـه لەوانەیه هەڵبەستراوی قسـەی کەسـێکی زەعیـف بێـت، هێشـتا لایـان باشـتره لـه بەکارهێنانـی عەقـڵ وقیـاس!! هەتـا ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل لـه چەنـد دێـره شـیعرێکدا مەنهەجـی سـەلەفییەتی نصوصـی کۆدەکاتـەوە کـه دەڵێـت:

دين النبي محمد آثار نعم المطية للفتى الاخبار
لا تخدعن عن الحديث واهله فالرأي ليل والحديث نهار!!!

دینی پێغەمبەر محەمەد ئاسەوارەکانیەتی [ئەوەی لێی بە جێماوە]، چاکترین پشت بۆ کەسێک هەڵیگرێت ئەخبارە، فریوتنەدەن لە حەدیس وهەڵگرانی، چونکە [ڕا] شەوە و حەدیس ڕۆژ و نەهارە!!!

## قۆناغی دووەمی دامەزراندنی سەلەفییەت

قۆنـاغی دووەمی دامەزراندنی سـەلەفییەت لەسـەر دەسـتی ئیبن تەیمیە [ - ٧٢٨] بوو، کـه لـه کۆتـایی خەلافەتـی عەباسـی دەرکـەوت پـاش ڕوخانـه بەناوبانگەکـەی بەغـدا لـه ٦٥٦ هیجری، کـه جیهانـی ئیسـلامی سـەرتاسـەر توشـی ڕاچڵەکاندنێکی سـەرسام کـرد و خەڵـک بـه دوای هۆیـەکان دەگـەڕان، لـه گەرمـەی ئـەو سـاتە مێژویانـەدا، ئیبـن تەیمیـه دەرکـەوت وزۆر بـه گەرمـی کەوتـه دەستنیشـانکردنی ئەوانـەی –بـەرای ئـەو- ببونـه هـۆی ڕوخانـی بەغـدا وخەلافەتـی ئیسـلامی عەباسـی!.

ئیبـن تەیمیـه ئەهلـی بیدعـه بـه سـۆفی وجەهمیـه وموعتەزیلـه وقـەدەری وباتینیـەکان وفەیلەسـوفەکانیش بـه هـۆی سـەرەکی ئـەو ڕوخانـه دەسـتنیشـان کـرد، وتوانـی بـەو

خیتابە حەماسی وعاتیفیەی کاربکاتە سەر بیرکردنەوەی خەڵکێکی زۆر وبیانکاتە دوژمنی هەموو ئەوانی ئەو ناوی نابوون بە ئەهلی بیدعە!
سەلەفییەت لەسەر دەستی ئیبن تەیمیە گەیشتە لوتکەی تەواوبوونی وەک مەزهەبێک، هەرچەندە ئیبن تەیمیە بنچینەی دژایەتی نێوان خۆیان وەک سەلەفییەت و ئەوانی تر توندتۆڵتر کرد، بەڵام لەژیانی خۆیدا هێز و توانایەکی وای پەیدا نەکرد، وەک ئەحمەدی کوڕی حەنبەل یان وەک محمدی کوڕی عبد الوهاب، تا بتوانێت زۆر لە بیروڕاکانی بخاتە بواری جێبەجێ کردن، کە گرنگترینیان چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ غەیری سەلەفیەکان. چونکە زۆربەی بیروڕا توندەکانی ئەمڕۆ بۆتە دەستوری حەرەکاتی سەلەفی جیهادی. کە ئەو هەموو کارەساتە ونامرۆییە بەرهەم دەهێنێت کە دەیبیین، وچۆن بۆتە هۆی دزێوکردنی خودی موسڵمانان پێش ئیسلامیش.

## دامەزرێنەری قۆناغی سێیەمی سەلەفییەت

دوایی لە قۆناغی سێیەمدا محمدی کوڕی عبد الوهاب وەک دامەزرێنەری سێیەمی سەلەفییەت دێتە ژماردن، بەڵام وەک پێشتر باسم کردوە، ئەو کەسە نە لە ئاستی نیازپاکی و تەقوا و حەز بە نەڕشتنی خوێنی خەڵکی، ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو، نە لە ئاستی زانستی ئیبن تەیمیە بوو، نە وەک ئەوان نزیک بوو لە مەڵبەندێکی شارستانی گەورەی وەک بەغداد و دیمەشق، بەڵام هەل و مەرجەکە بۆی لەبار بوو، کاتێ هاوپەیمانیەکی بەست لەگەڵ خانەوادەیەکی بەدەوی کەس نەناسی وەڵ ئالی سعود، و توانی لەڕێگای پەلکیشکردنی عەشیرەتە بەدەویەکانی تری نەجد، خەڵکێکی زۆر بە پاڵنەری تالان و برۆ لە بەرگی شەرعیەتدا کۆبکاتەوە، و بە دڵەقترین شێوە تیۆرەکانی خۆی جێبەجێ بکات بەسەر موسڵمانانی غەیرە وەهابی، بە تەکفیرکردنی سەرتاسەر و داواکردن لێیان بە بونەوە موسڵمان و لە کۆتاییشدا بە کوشتنیان. بەڕای من زۆربەی زۆری کوشتارە خوین ساردەکانی توندرەوە سەلەفیەکان، لە تەقاندنەوە و سەربڕین و بە کۆمەڵ کوشتنی خەڵک دەگەڕێتەوە بۆ توراس و کەلەپوری وەهابیەت و دامەزرێنەرەکەی. ئەوەی مێژووی ابن غنام بخوێنیتەوە سەری سپی دەبێت، لە وەسفکردنی خەڵکی گوند

و شارۆچكەكان بە [مشركين] و لە بەتاڵان بردن و كوشتنیان و دەست بەسەر ژن و منداڵەكانیان داگرتنیان، وەک بڵێی شەڕی پێغەمبەر و كوفاری قورەیشە!

## خەسڵەتە سەرەكیەكانی سەلەفییەت

بەڵام لە واقیعدا دەبێت بەرلەوەی وەسفی خەسڵەتە سەرەكیەكانیان بكەین  دەبێت بزانین باسی كام سەلەفییەت دەكەین، كە خۆیان لە دوو تەوژمی سەرەكی دەدۆزنەوە، كە سەلەفییەتی دەعەوی و سەلەفییەتی جیهادیە. كەسانێک دەڵێن هەرچۆنێكی بێت سەلەفییەتی دەعەوی چاكترە لە سەلەفییەتی جیهادی خوێنڕێژ و سەربڕ و تەكفیركەر.
لەوانەیە لە ڕوێكی ڕووكەشدا وابێت، بەڵام لە ڕووی تردا هەردوكیان زیانی زۆر گەورە بە تاک و كۆمەڵ و بواری فیكری وسیاسی و زانستی مرۆڤەكان دەگەینن. ڕاستە تەوژمی جیهادی سەلەفی، زۆربەی تیۆرە سەلەفیەكان وەگەڕ دەخات و دەیخاتە بواری جێبەجێ كردن، بۆ نمونە فەتوای [التترس] ی بەناوبانگی ئیبن تەیمیە كە لە پەنایدا سەدان و هەزاران موسڵمان دەكوژن، كە ڕێگا دەدات بە كوشتنی موسڵمانان ئەگەر دوژمن كردنی بە قەڵغان، بەڵام ئەمڕۆ سەلەفیەی جیهادی هەموو جیهانی لیبوە بە دوژمن بە موسڵمانانەوەش، تەنها ئەگەر لە دەرەوەی بازنەی ئەواندابن، بۆیەش هەرگوێشی پێنادەن چەند كەس دەكوژرێن ناكوژرێن گەورەترین قەسابخانە ئەنجام دەدەن بێ ئەوەی دڵیشیان خورپە بكات، ئەگەر بتەوێ ڕادەی ئیستهتاریان بەخوێنی موسڵمانان بزانیت، ئەوە باسی خوێنی ئەوانیتر هەرناكەین كە ئەوانیش حورمەتی خۆیان هەیە. بەس بڕوانە ئەو ڤیدیۆیانەی كە تاوانەكانی خۆیانیان تیایدا تۆمار كردوە بە شانازیەوە، بە تایبەتی ئەو فیلمەی كە لەسەر نەخۆشخانەكەی یەمەن ئاشكرابوو، بڕوانە چەند بێباكانە دكتۆری ژن و پیاو و نەخۆشی پیر و منداڵ و جاحێڵ دەكوژن.

## سەلەفییەتی بانگخوازی

کاتێ دیینە سەر سەلەفییەتی دەعەوی و دەعوەت، ئەوە بە پێچەوانەی ئەوانە، ئەو جیهادیانەیان پێ تەکفیریە، و بەڵام چۆن ئەوان حوکامەکان بە کافر و زەندیق دەزانن، ئەوە سەلەفییەتی دەعەوی بە پێچەوانەی ئەوان بە وەلی ئەمر وواجیبی تاعەتیان دەزانن و دەرچوون لە دژیان بە حەڕام دەزانن وهەتا ستەمییان لێکردی و مالیشیان لێ زەوتکردی و زانایەکیان بەو دواییە وتی هەتا هەتکی ناموسیشی کردی!!! لە کۆنەوەش خاوەنێ طبقات الحنابلة، القاضي ابو يعلي دەڵێت: حەنبەلیەکان سێ جۆرن:

جۆرێکیان زاهیدن خەریکی نوێژ و ڕۆژوون، جۆرێکی تر خەریکی نوسین و فیقهن، جۆری سێیەمیان شەق دەوەشێننە هەموو کەسێکی جیا لە خۆیان!! طبقات الحنابلة ٧٦/٣.

## بۆچی سەلەفیەکان توندن بەرامبەر کەسان و مەزهەبەکانی تر؟

ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ هەر فیکرەیەک کە خۆی بە هەقی سەرتاسەر زانی و خەڵکی تری سەرتاسەر پێ هەڵە بوو، ئەو ئەنجامەی لێدەکەوێتەوە. کاتێک ئەلبانی پێی وابێت خوا دامەزرینەری سەلەفییەتە، و کاتی سەلەفییەت بەپیی بڕوای نەبزواوی تەنها خۆیان [فرقەی ناجیە] ن لە نێوان ئەو ٧٣ تیرەیەی کە لە ئیسلامدا دەیتەوە بەپیی حەدیسێک. کەوابوو بەشێوەیەکی تۆماتیکی ئەوانی تر هەموو دەچنە خانەی بەدباوەڕی و گومراییەوە، یانی توندوتیژیەکە لە ئالیەت و میکانیزمی بیرکردنەوەی سەلەفییەت سەرچاوە دەگرێت.

## ئەلبانی دەڵێت: خوا دامەزرێنەری دەعوەی سەلەفیە!؟؟؟

لە کتێبی المنهج السلفي عند الشيخ ناصرالدين الالباني، دا هاتوە: پرسیاریان لە شێخ ناصرالدين الالباني کرد گوایە ڕاستە وتویەتی: ان مؤسس الدعوة السلفية هو الله!!! [خوا دامەزرێنەری دەعوەی سەلەفیە] لە وەڵامدا گوتی: بەڵێ، وامگوتوە، ئەوە سیفەتێک نیە، بەڵکو قسەکردنە دەربارەی اللە بە زمانمان بۆ گوزارش کردن لە هەقیقەتێکی واقیعی!!!!!!!! ئینجا دەڵێت :»ئەوەی سەر بە سەلەف بێت

سەر بە عیسمەتە بە شێوەیەکی گشتی،»! عصمة تیش یانی دوور بوون لە هەڵە و گوناه کردن!! ئینجا دەڵێت «چونکە تەنها ئەو ڕێگایە ڕێگای [فرقەی ناجیە]ی بۆ دەستەبەر دەکات "!!!
[الذي ينتسب الى السلف الصالح فانه ينتسب الى العصمة على وجه العموم" لان " ذلك تيسر له سبيل الفرقة الناجية"
ئەوە سەرەڕای ستایش و تەقدیس ومەدائیحەکانی ابن حنبل و ابن تیمیە وابن عبد الوهاب وپیاوانی سەلەف و وتا دەگاتە پیاوانی سەلەفیەتی ئەو زەمانە. ئێستا کەس هەیە پێی سەیر بێت بۆ بابای سەلەفی هێدە بڕوای بەخۆیەتی ووادەزانێت هەقیقەتی ڕەها بەس لای ئەوە وبە قین وبە سک پێ سوتانەوە دەڕوانێتە موسڵمانانی تر وتەنها خۆی پێ [فرقەی ناجیە] یە؟!!
بۆیە من پێموایە کێشە نیە سەلەفی جیهادی بیت یان مەدخەلی و دەعەوی، چونکە هەردوکیان یەک میکانیزمی عەقڵی، و ئیمانی دەیانبات بەڕێوە، یەکیان خوێنی مرۆڤ بە هەدەر دەدات، ئەوەی تر کەرامەت و مرۆڤایەتی مرۆڤ بە هەدەر دەدات، بە ڕوتکردنەوەی لە عەقڵ و پەکخستنی ئەو نیعمەتە گەورەیەی خوا، و بە ملکەچ پێکردنی بۆ هەر ملهوڕێک و تاغیە و دیکتاتۆرێک.
توندی نواندن لە لەبزەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە کوشتن و خوێن هەدەر کردن، هەرچەندە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، زۆر هەڵوێستی باشی لێدەگێڕنەوە لەمەر تەبایی و هاوژیانی لەگەڵ کەسانی تر، هەتا لەگەڵ شیعە بەرایەکانیش کە لەسەر دەستی هەندێکیان هەتا خوێندویەتی، لەوانەش تليد بن سليمان المحاربي، ابو عبدالرحمن الكوفي، کە ئەحمەد دەربارەی دەڵێت: ان مذهبه التشيع ولم ارى به بأسا!!
باسی کەسێکی شیعی بەناوی عبدالرحمن بن صالح دەکەن کە سەردانی ئیمام ئەحمەدی دەکرد، و ئەویش نزیکی دەکردەوە، پێیان گوت: ئەی باوکی عبدالله ئەوە رافزییە، لەوەڵامدا گوتی: سبحان الله، کەسێک کەسانێکی خۆش دەوێت لە خانەوادەی پێغەمبەر [د.خ] پێیان بڵێین خۆشیانت مەوێ؟ ئەو سیقەیە. تاریخ بغداد ٢٦١/١٠.
بەڵام هەر سەلەفیەکانیش دەیان وسەدان ڕیوایاتی وا لە ئیمام ئەحمەدەوە دەگوێژنەوە، کە تێکرایان جەخت دەکەنەوە لەسەر تەکفیر و تفسيق وتبديع زانایانی گەورەی ئیسلام چ جای خەڵکی ئاسایی!

بەشی دووەم

**ئەحمەدی کوڕی حەنبەل: قوربانی یان جەللاد؟!**

**عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل**

**هێرش بۆ سەر جەهمیەکان و ئەبو حەنیفە بۆ؟!**

**بۆ دەبێت باوەڕ بکەین ئەحمەد تەکفیرچی بووە؟!**

**باوکانی سەلەفییەت: تەکفیر و جوێن باران کردنی ئەبو حەنیفە**

**تەکفیر و جوێن باران کردنی ئەبو حەنیفە**

**کە تەکفیر و جوێن دەبێتە پیشەی سەلەفیەکان**

**دڵخۆشبوون بە مردنی زانایەکی وەك ئەبو حەنیفە!**

## ئەحمەدی کوڕی حەنبەل: قوربانی یان جەللاد ؟!

میکانیزمی پەیوەندی نێوان سەلەفییەت وئەوانی تر (الاخر) لە بنچینەدا لەسەر توندو تیژی وسڕینەوەی ئەوی تر وتەکفیر وتەفسیق وتەبدیع کردن دامەزراوە. ئەو دامەزراندنەش بە پێی سەرچاوە باوەڕ پێکراوەکانی عەقیدە وفیکری سەلەفییەت هەر لەسەرەتاوە تۆوەکەی بە دەستی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل چێندراوە وئیبن وتەیمیەش نەمامەکەی ئاوداوە ومحمدی کوڕی عبد الوهابیش بەرەکەی بەخشیوەتەوە بەسەر زەمان ومەکاندا.
دەبا باس لەڕۆڵی هەر یەکێک لەوانە بکەین لە دامەزراندنی عەقڵیەتی توندڕەوانەی سەلەفییەت

## ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

ئەدەبیاتی سەلەفییەت وبەڵکو ئەدەبیاتی ئەوەی ناوی دەنێن بە ڕابوونی ئیسلامی زۆر بە شێوەیەکی چەواشەکارانە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی وەک قارەمانێکی خۆڕاگری ئەشکەنجەدان وئازادی بیر نیشان دەدا، ئەوەش وەک ئاماژەم پێکرد لەسەرتاسەری لایەنەکانی ڕابوونی ئیسلامی بوو نەک تەنها لەلایەن سەلەفیەکان. دەیەها وتار وکتێب وچیرۆکم خوێندۆتەوە لەسەر ئەشکەنجەدانی موعتەزیلەکان بۆ ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وخۆڕاگری ئەو لەبەرامبەر ئەو هەموو ئەشکەنجە وفشارەی لەسەری بوو لەو کێشەیەی کە ناوی دەنێن بە میحنەی خەڵقی قورئاندا!!
هل يعود القول بخلق القرآن إلى زمن المحنة أي : ٢١٨-٢٣٢هـ أم أنه قبل ذلك بكثير، وإذا كان القول يعود إلى زمن قبل زمن المحنة بأكثر من قرن من الزمان على الأقل، فلماذا لم تحدث محنة فيه قبل ذلك ؟ فمدونة أهل الحديث ( الحنابلة ) تقول أنَّ أبا حنيفة ت ١٥٠هـ استتابه أصحابه من القول بخلق القرآن، والمدونة تقول بوجود صراع حول سورة المسد، لقد ورد في ترجمة عمرو بن عبيد المعتزلي المشهور في تهذيب التهذيب وكانت وفاته ١٤٤هـ ما يلي : وقال أحمد بن إبراهيم الدورقي عن معاذ بن معاذ سمعت عمرو بن عبيد يقول : إن كان ((تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ)) في اللوح المحفوظ فما لله على ابن آدم حجة ! يقصد عمرو بن

عبيد أنَّ السورة مخلوقة والبنية الفكرية لها دالة دلالة واضحة على خلقها . فما هي الحجة على أبي لهب إنْ كان قد دُوِّنَ عليه : ( تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ) منذ الأزل ؟ ئەو كێشەیە (كێشەی خەڵقكردنی قورئان) گوایە دەگەڕێتەوە ساڵانی ٢١٨ تا ٢٣٢ هیجری، وگوایە یەكەم كەس ئەو باسەی خستبێتە ڕوو جەعدی كوڕی درهەم بوبێت، بە پێی كتێبەكانی عیلمی كەلام. دوایی جەعد لەسەر دەستی والی ئومەویی خالیدی كوڕی عەبدوللای قەسری بە دڕەندەترین شێوە سەری بڕا لە ڕۆژی جەژن ولەژێر مینبەری مزگەوتدا!! هەموو زانا ونەزانە سەلەفیەكان بەو پەڕی شانازییەوە باسی ئەو سەربڕینە دەكەن، بەبێ دانانی هیچ حورمەتێک بۆ خوێنی زانایەكی موسڵمان لەناو مزگەوت ولەرۆژی جەژنیش!! هەر ئیبن تەیمیە لە منهاج السنه زیاتر لە ١٣سێزدە جار باسی ئەو پاڵەوانێتیە دەكات!

بەڵام ئەوەش زۆر جێگای باوەڕ نییە، چونكە هەندێ هەواڵێتر هەر لە سەرچاوە سەلەفیەكان دەیسەلمێنن كە سەدەیەک پێش ئەو مێژووە، وەک لە مدونة اهل الحديث دا هاتووە، كە هاوەڵانی ابو حنيفە تۆبەیانداوە لە وتنی خلق القرآن! كە ابو حنيفە لە ١٥٠ ی هیجری كۆچی دوایی كردوە! هەر هەمان سەرچاوەی حەنبەلی دەڵێت كێشە هەبووە لەسەر سورەتی المسد، كە لە ژینامەی عمرو بن عبيد المعتزلي بەناوبانگدا هاتووە كە گوتویەتی: ئەگەر (تَبَّتْ يَدَا أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ) لە لەوحی مەحفوزدا هاتبێت، كەوابوو خودا هیچ حوجەتێكی نییە لەسەر بەنیادەم! یانی مەبەستی عمرو ئەوەیە كە سورەتەكە مەخلوقە، چونكە تاوانی ئەبو لەهەب چییە ئەگەر ئەو سورەتە لە ئەزەلەوە لە لەوحی مەحفوزدا نووسرابێت لە سەری؟! كەوابوو ڕاست نییە و بونیادی سورەتەكە دەیسەلمێنێت كە مەخلوقە بەپێی ڕووداوەكە. كێشەی تریش زۆرە لەسەر ئەو میحنەیە بەڵكو لە لێكۆڵینەوەیەكی تایبەت باسیان بكەین.

ئەو كێشەیە هەرچەندە ڕەهەندێكی سیاسی زۆری هەیە بەپێی لێكۆڵینەوە نوێیەكان، زیاتر كێشەیەكی سیاسی خەلافەتی عەباسی بوو بۆ لێدانی نەیارەكانی، و لە دروستكراوی دەسەڵاتیش بوو، بەڵام دەتوانین بڵێین بە شێوەیەكی زەق وئاشكرا لەسەردەمی خەلیفە مەئمونی عەباسیدا سەری هەڵدا، دەڵێن كاتێک موعتەزیلەكان وتیان قورئانیش خولقێنراوی خوایە وەک هەموو مەخلوقاتەكانی تری بەگیان وبێ گیان. هەرچەندە خودی ئیبن تەیمیە دەیسەلمێنێت كە مەئمون تەبەنای قسەی جەهمیەكانی كردوە نەک موعتەزیلە، ئەوە باسێكیترە! لە ئەكامدا دەوڵەت ئەو

بیروڕایەی تەبەنا کرد، چونکە مەئمون خۆشی لایەنگرێکی سەرسەختی ئەو ڕایە بوو، وەک زانراوە مەئمون ڕۆشنبیرترین خەلیفەی موسڵمانانە، لە هەموو مێژووی ئیسلامدا. مەئمون ویستی ئەو ڕایە بە زۆر بەسەر هەموو خەڵکی بسەپێنیت لە پێناو ئامانجێکی سیاسیدا! خەلک بەگشتی زوو چوونە ژێر بار، بەڵام زانایان بەشێکی بە بڕواوە قبوڵیان کرد، بەشێکی تر لە ژێر گوشار وەک التقیە قبوڵیان کرد وەک (یحیی بن معین وابن سعد وابن المدینی)، ودوابەشیش ڕەتیان کردەوە کە لە نێو ئەوانە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بوو، بەڵام ئیمام ئەحمەد تەنها نەبوو لەو هەڵوێستە بەڵکو کەسانێکی لەو ناودارتر کوژران لەو کێشەیە وەک:، ابو نصر الخزاعی و ابو نعیم فضل بن دکنی کەسانێکی تر لە زیندان سەریان نایەوە وەک:.ئەبو عەمری حارسی وکەسانێکی تر.

ناودار بوونی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لەو میحنەت وکێشەیە، دەگەڕێتەوە بۆ ڕزگاربوونی لە کوشتن، وگۆڕانی عەقیدەی دەوڵەتی عەباسی لە موعتەزیلەوە بۆ عەقیدەی ئەهلی حەدیس لەسەر دەستی خەلیفە موتەوەکیل. بێگومان زانایەکی زۆری وەکو ئیمام البخاری وشافیعی وعلی المدینی ویحی بن المعین، وچەندین مامۆستا لە مامۆستاکانی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل زۆر بە ئاسانی لەو کێشەیە ڕزگاریان بوو، چونکە هەموو کێشەکە لەفزی بوو، بەڵکو زیاتر لە کێشەیەکی تەرەفی وشەڕلە بەتاڵی دەچوو، ئەگینا کێ لەو ئومەتە پێویستی بوو بزانێت قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نییە؟!!

هەرچەندە بە ڕای ئێمە ئەو میحنەتە بە ئامانجێکی سیاسی ئیفتیعال کرابوو، چونکە دەسەڵاتی عەباسی دەیانزانی عەقڵیەتی سەلەفی شەعبەوی و عاتیفی چۆن کاردانەوە دەکات، و ئەوانیش چۆن بە مشتێکی پۆلایی لێیان دەدەن تا لغاویان دەکەن بۆ دەسەڵاتی خۆیان، چونکە حەنبەلیە سەلەفیەکان هەوایان ئومەوی بوو نەیاری دەوڵەتی عەباسی بوون!

بەڵام سەرەڕای ئەوەش ڕەتکردنەوەی ئەو مەفهومەی کە دەڵێت قورئان مەخلوقە، بە ناچار مرۆڤ بەرەو قەولی قەدیمی وهەربوونی قورئان دەبات، ئەوەش ناسازە لەگەڵ بوونی تەنها یەک قەدیم ویەک بێ سەرەتا کە ئەویش خوایە، «بێگومان ئەحمەدی کوڕی حەنبەل گومانی نەبوە، لەوەی کە لەفزەکانی قورئان، وئەو حیبرەی پێی نوسراوە ولەگەڵ کاغەزەکەی هەمووی دروستکراو ونوێ بوون، وقەدیم وئەزەلی نەبوون، بەڵام بە پێی مەنتیقی سەلەفیانەی، چونکە هیچ

بەڵگەیەكی لە قورئان وسونەت وهاوەڵانی پێغەمبەری لا نەبوو لەو بارەیەوە بۆیە بەبێ یەك ودوو ڕەتی دەكردەوە.
كەچی زانایەكی فەقیهی ئوسولّی – بەزاراوەی فیقهی – گەورەی وەك ئیمامی شافیعی، لای هیچ تاوان نەبوو بە شێوەیەكی مەنتیقی لە كێشەكە بڕوانێت، وبەدان هێنان بەوەی كە لەفزەكانی قورئان وئەو حیبرەی پێی نوسراوە ولەگەڵ كاغەزەكەی هەمووی دروستكراو ومەخلوقن. بەو شێوەیە ڕزگاری بوو لەو مەهزەلەیەی، كە نەدەبوایە كێشەیەكی فیكری و عەقیدی ڕووتی وا بەسەر خەڵكیان سەپاندبایە، هەرچەندە بەڵگەی بەهێزیش هەیە وەك ئاماژەمان پێكرد، كە موعتەزیلەكان بەری بوونە لەو میحنەتە، چونكە ئەوان سوارچاكی عەقلانیەتن لە مێژووی ئیسلامدا. ئەو كێشەیە سیاسی كردە لە جیاتی گرنگیدان بە پرسە چارەنوس سازەكان، هەموو گۆڕەپانی ئیسلام و موسڵمانانی تەسلیمی دواكەوتوترین ودڕەندەترین گروهی ئیسلام كرد، وبەو كارەیان گورزێكی سەختیان لە ئاڕاستەی عەقلانیەت دا كە تا ئێستا پشتی لێ ڕاست نەكردۆتەوە. بەڵام دەسەڵاتی سیاسی لە كۆنەوە لە پێناو بەرژەوەندییە كورتمەوداكانی قوربانی بە هەموو ئامانجێكی گەورەی دوورخایەنیش دەدات!
بێگومان ئەو وێناكردنەی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل وەك قوربانیەك، كاری كردۆتە سەر هەموو عەقڵیەتی بەناو ڕابوونی ئیسلامی لە وەرگرتنی هەڵوێستی سەلبی لە هەموو ئاڕاستەیەكی عەقڵانی و فیكری موعتەزیلی دا، كە وەك ئەهریمەنێك نیشانی خەڵك دەدرێن، ئەوەش لە ئەنجامدا بوەتە هۆی دژایەتی كردنێكی سەرتاسەری بۆ هەموو ئاڕاستەیەكی عەقڵی لەناو ئیسلامدا، وزاڵبوونی ئاڕاستە نا عەقڵییەكان بەسەر موقەدەراتی موسڵماناندا لەسەر ئاستی جیهاندا.
ئەو ڕیوایەتانەی كە لە ئەحمەدی كوڕی حەنبەل وە دەگێڕدرێتەوە لە كتێبە عەقایدەیەكانی سەلەفیەكان یان حەنبەلیەكان دەربارەی تەكفیر كردنی موسڵمانانی تر هێندە زۆرە دەگاتە ئاستی متواتر – واتە زۆر ڕاستە وئەستەمە گومانیان لێبكرێت – . ئەوانەش كەمێكن لەو ڕیوایەتانە: لە كتێبی طبقات الحنابلە لابن ابی یعلی لەدەمی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل دەگێڕنەوە: (من زعم ان القرآن مخلوق فهو جهمي كافر ومن زعم ان القرآن كلام اللە ووقف ولم يقل ليس بمخلوق فهو اخبث من قول الاول ومن زعم ان الفاظنا بە وتلاوتنا لە مخلوقە والقرآن كلام اللە فهو جهمي ومن لم

یكفر هـؤلاء القـوم كلهـم فهـو مثلهـم)!! طبقـات الحنابلـه لابـن ابـی یعلـی ٢٩ (ئـەوەی گوتـی قورئـان مەخلوقـە ئـەوە كافرێكـی جەهمییـە، ئـەوەی تەنهـا گووتـی قورئـان كەلامـی خوایـە ووەسـتا ونەیـوت مەخلـوق نییـە ئـەوە قسـەكەی لـە قسـەی یەكـەم پیسـترە، ئەوەشـی گووتـی لەفـز وخوێندنەوەمـان بـۆ قورئـان مەخلوقـە وقورئانیش كەلامـی خوایـە: ئـەوە جەهمییـە، وئەوەشـی ئەوانـە بەكافر نـەكات (تەكفیـر نـەكات) ئـەوە وەک ئـەوان كافـره ) وقـال سـمعت ابـا عبـد اللـه یقـول مـن قـال: لفظـی بالقرآن مخلـوق فهـو كافـر، ل ١٢٨) ئەوەی گووتـی لەفـزی بـە خوێندنـەوەی قورئـان مەخلوقـە كافـره.

)سـمعت ابـا عبـد اللـه یقـول مـن قـال: القرآن مخلـوق فهـو كافـر ومـن شـک فـی كفـره فهـو كافـر. ل ١٢٨ ) ئـەوەی گووتـی قورئـان مەخلوقـە كافـره، ئەوەشـی گومانـی هەبێت لـە كافربوونـی ئەویش كافره )هەروەهـا دەڵێت: روی عـن إمامنـا أشـیاء: منهـا قـال سـمعت أحمـد یقـول مـن قـال لفظـه بالقـرآن مخلـوق فهـو جهمـي مخلـد فـي النـار خالـدا فیهـا ثـم قـال وهـذا شـرک باللـه العظیـم. ل٣١ )

(ئەوەشـی گووتـی لەفـزی بـە خوێندنـەوەی قورئـان مەخلوقـە، ئـەوە جەهمییـە بـۆ هەتـا هەتایـی لەنـاو ئاگـری دۆزەخ دەبێـت ئینجـا گووتـی ئـەوە شـیرک بڕیاردانـە بـۆ خـوا ) ئـەو قەولـەش قەولـی زۆربـەی زانایانـی ئیسـلامە بـە بوخارییـەوەش، وهەروەهـا قەولـی زۆربـەی هـەرە زۆری مەزەبەكانـی تـره جگـە لـە حەنبەلیـەكان. كەوابـوو بەلایەنـی كـەم نـۆ بـەش لـە دەبەشـی جیهانـی ئیسـلام كافـرن بـە قسـەی ئەحمـەدی كـوڕی حەنبـەل!!

ئینجـا لـە هەنگاوێكـی تـر ئەحمـەدی كـوڕی حەنبـەل فەتـوای خوێـن ڕشـتنی هەمـوو موسـڵمانانی تـر دەدات جگـە لەوانـەی هەمـان قەولـی حەنبەلیـەكان یـان سـەلەفیەكان دووبـارە ناكاتـەوە، لێـی دەگێڕنـەوە دەڵێـت: (الجهمیـة افترقـت ثـلاث فـرق فقالـت طائفـة منهـم: القـرآن كلام الله مخلـوق وقالـت طائفـة: القـرآن كلام الله وسـكتت وهـي الواقفـة الملعونـة!! وقـال بعضهـم: ألفاظنـا بالقـرآن مخلوقـة، فكل هؤلاء جهمیـة كفار! یسـتاتبون فإن تابـوا وإلا قتلـوا) طبقـات الحنابلـة، ل ٢٥٣ (جەهمییەكان بوونـە سـێ دەسـتە: هەندێكیـان گوتیـان قورئـان كەلامـی خوایـە ومەخلوقـە، دەسـتەیەكی تـر گوتیـان: قورئـان كەلامـی خوایـە ووەسـتا ئەوانـەش وەسـتاوە نەفرەتیەكانـن!! دەسـتەیەكی تریشـیان گوتـی: لەفـزی بـە خوێندنـەوەی قورئـان مەخلوقـە. هەمـوو ئەوانـە جەهمـی كافـرن، تۆبـە دەدرێـن ئەگـەر نەیانكـرد ئـەوە دەكوژرێـن)

لـه ڕیوایەتێكـی تـر ئەحمـەدی كـوڕی حەنبـەل هەتـا ژن پێدانـی ئـەو كەسـانە یاسـاغ دەكات وبەڵكـو خواردنـی گۆشـتی ئـەو ئاژەڵـەی كـە بەدەسـتی ئەوانـەی دەڵێـن قورئـان مەخلوقـە حـەرام دەكات ئـەوە لـە كاتێكـدا هـی جوولەكـە ومەسـیحیش دەخورێـت، كەچـی بـە ڕای ئیمـام ئەحمـەدی كـوڕی حەنبـەل هـی موسـڵمانێك ناخورێـت كـە بـڕوای بـە خـوا وپێغەمبـەر وقورئـان هەیـە!!: (أن من هذه مقالته إن لم يتب لم يناكح ولا يجوز قضاؤه ولا تؤكل ذبيحته) طبقات الحنابلة. ل ٢٥٣.

شـتێكی زانـراوە كـە زانایانـی ئیسـلام تـا پێیـان بكرێـت خۆیـان لـە تەكفیركردنـی موعەیـەن واتـە كەسـێكی دیاریكراو دەپارێـزن، كەچـی لێیدەگێڕنـەوە كـەوا زانایەكـی گـەورەی شـافیعییەكانی سـەردەمی خـۆی حوسـێن كەرابیسـی تەكفیر كـردوە بەنـاو: (حدثنا موسى بن محمد الغساني حدثنا شاهين بن السميذع قال: سمعت أبا عبد الله أحمد بن حنبل يقول الحسين الكرابيسي عندنا كافر) (الحسين الكرابيسي عندنا كافر) طبقات الحنابلة ل ١٢٨.

سـەیر لەوەدایـە ئـەو زانـا شـافیعییە زانایەكـی گـەورەی جـەرح وتەعدیل بـوو، وهەتـا لەوانـە نەبوو كـە دەیـان وت قورئـان مەخلوقـە، هەتـا ئەگـەر لەوانیش بوایـە بـۆی نییـە تەكفیـری ئـەو كەسـانە بـكات كـەوا دەڵێـن. حدثنـا يحيى بـن زكريـا بـن عيسـى قـال: سـألت أحمـد بـن حنبـل فقلـت: يـا أبـا عبـد اللـه مـا تقـول فيمـن يقـول القـرآن مخلـوق فقـال: كافـر ولـم يتعتـع فـي الجـواب. ل ٢٩٠

(پرسـیارمان لـە ئەحمـەدی كـوڕی حەنبـەل كـرد چـی دەڵێـی دەرهـەق ئـەوەی دەڵێت:قورئـان مەخلوقـە؟ گـووتـی كافـرە بەبـێ دڵ لـە دڵ دان لـە وەڵامدا)قـال بعـض العلمـاء منهم أحمـد بـن حنبـل الجهمي كافر ليـس مـن أهـل القبلـة حـلال الـدم لا يـرث ولا يـورث.ل ٣٣٣( جەهمـی كافرە وئەهلـی قیبلـە نیە وخوێنـی حەڵاڵـە ومیراتـی بـۆ نیـە ومیراتـی نیـە )بێگومـان ئـەو تونـد وتیژییـەی حەنبەلیـەكان كـە ئیمامەكەیـان وا ڕاسـت وچـۆپ زانـا وخەڵكـی گشـتی تەكفیـر بـكات، دەبێـت زانـاكان وفەقێیەكانـی خـوار ئـەو پلەیـە چیـان بەخەڵـك كردبێـت، كەچـی كاتێـك زانایـەك بەنـاوی ( ابـن ابـی قتیلە ) زەمـی حەدیسـبیەكانی كردبـوو كـە ئـەوە ناوێكـی تـری حەنبەلیەكان بوو وتبووی (كەسـانێكی خراپـن) (قـوم سـوء)، كـە ئـەو زەمكردنـە گەیشـتەوە ئەحمـەدی كوڕی حەنبـەل گووتـی: : ئـەوە زەندیقـە، زەندیقـە، زەندیـق : (زنديـق، زنديـق، زنديـق) (ل ٢٤) طبقات الحنابلة.[١] كەوابـوو هەتـا زەم كـردن وڕەخنەیەكـی سـادەش لەكەسـانی تر بەرامبـەر حەنبەلیەكان

بـە کوفـر دادەنرێـت، کەچـی بەخۆیـان ڕاسـت وچـۆپ زانـا وعەوامـی موسـڵمانانی غەیـری سـەلەفی تەکفیـر وتەفسـیق وتەبدیـع دەکـەن هیـچ نییـە. سـەیر لـەوە دایـە کـە هـەر لـە نێـو حەدیسـییەکان خۆبەخـۆ بـە توندتریـن سـیوە یەکتـری ڕەخنەبـاران دەکـەن، بڵێـی ئەوانیـش زەندیـق بـن، زەندیقیـش بەمانـای کافـر دێـت.

یەکێک لـەو زێدەڕۆییە سـەیر وسـەمەرانەی ئەحمـەدی کوڕی حەنبـەل ئەوەیە گوایە یەکێـک پرسـیاری لێکـردوە: نوێـژ بکـەم لـە دوای ئـەوەی مـەی دەخواتـەوە؟ گووتـی: نەخێـر، کابـرا گووتـی: ئـەی نوێـژ بکـەم لـەدوای ئـەوەی دەڵێـت قورئـان مەخلوقـە؟ ئەحمـەد گووتـی: سـبحان اللـە نایەڵـم لـەدوای موسـڵمان بیکەیـت، کەچـی پرسـیاری کافـرم لێدەکەیـت؟!! ئـەوەش ڕیوایەتـە عەرەبیەکەیـە: (أصلـي خلـف مـن يشـرب المسـكر؟ قـال: لا، قـال الرجـل: فأصلـي خلـف مـن يقـول القـرآن مخلـوق؟ قـال أحمـد: سـبحان اللـه: أنهـاک عـن مسـلم تسـألني عـن كافـر) طبقـات الحنابلـة ٢٤٢

لـە هەمـووی سـەیرتر یەکێـک یـان حزبێـک یـان مەزهەبێـک ئەگـەر لەهـەر کۆمەڵگایـەک بکەوێتـە کێشـە لەگـەڵ یەکێکـی تـر یـان حزبێکـی تـر یـان مەزهەبێکـی تـر، هـەوڵ دەدات بەهـەر جۆرێـک خەڵکێـک بـۆ خـۆی ڕاکێشـێت، ئەگـەر هەرنەکـرا خەڵکێکـی زۆر تـا پێـی بکرێ بێ لایەنیـان کات، کەچـی وەک بەبـەر چاومـان کـەوت ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل هەتـا هـەق بـەو کەسـانەش نـادات کـە لـەو کێشـە بێ تامـەی خەلقی قورئـان بـێ دەنـگ بـن وهەڵوێسـت وەرنەگـرن، زۆر بـە تونـدی هێرشـیان دەکاتـە سـەر وناویـان دەنێـت بـە وەسـتاوەکان (الواقفييـن) وەک لـە نموونەکانـی پێشـوو دیمـان کـە دەڵێـت:

من زعـم أن القـرآن مخلـوق فهـو جهمـي كافـر ومـن زعـم أن القـرآن كلام اللـه ووقـف ولـم يقـل ليـس بمخلـوق فهـو أخبـث مـن قـول الاول. جارێکـی تـر دەڵێـت: وقالـت طائفـة: القـرآن كلام اللـه وسـكتت وهـي الواقفـة الملعونـة!! ل ١٨

هـەر لـەو بارەیـەوە دەڵێـت: (الواقفـي لا تشـک فـي كفـره) مناقـب أحمـد لابـن الجـوزي ل ٢٠٦. واتـە گومـان لـە کافـری وەسـتاوەکان (الواقفی) مەکـە، کاتـی خـۆی خەڵکـی ئاسـایی ئـەو قسـە توندانەیـان دەبیسـت لـە زانایانـی حەنبەلیـەت بۆیـە زۆربـەی خەڵکـە سـادە وسـاویلکەکان لـە ترسـی تەکفیـر دەچوونـە پـاڵ ئـەو غەوغائیەتـەی حەنبەلییـە سـەلەفیەکان، تـا ئەمڕۆش هـەر لـەو کۆمەڵگایـە دواکەوتـوو وبێ سـەوادانە گەشـە دەکـەن، وئـەو کەسانەشـی بـۆ خۆیـان دەکێشـن زۆربـەی نیمچـە خوێنـدەوار ونەزانـن، بـەڵام جـار وبـار خەڵکانـی خوێندەواریـش بۆیـان کێـش دەبێـت لەوانـەی

زیاتر شـەهادەی زانسـتی سرووشـتیان هەیـە، وكـەم روو دەدات خـاوەن بڕوانامـەی زانسـتە مرۆییەكانیـان فریویـان پـێ بخـۆن.
لـە وتەیەكـی تـر بەوەنـدەش ناوەسـتێت بەرامبـەر بـێ لایەنـەكان بەڵكـو دەڵێـت: ئـەوەی تەكفیریـان نـەكات (واتـە ئەوانـەی دەڵێـن قورئـان مەخلوقـە) گوێـی لێناگیرێـت وسـەلامی لێناكرێـت هەتـا كـەس وكاری نزیكیـش بێـت، وبەشـداری لـە جەنـازە ناشـتنی ناكرێـت، ولەكاتـی نەخـۆش بوونیـان بەسـەر ناكرێنـەوە!!!
) وأنـه لا يُسـمع مِمّـن لـم يكفرهـم ولا يسـلم عليـه ولـو كان مـن الأقـارب ولا تشـهد لهـم جنائـز ولا يعـادون فـي مرضهـم!! ) ئەگـەر ئـەوە سـزای بـێ لایەنێكـی بەسـەزمان بێت لـەلای ئـەو قارەمانـەی كـە لـە ئەدەبیاتـی سـەحوەی ئیسـلامی چەواشـەكار وەك گەورەترین قوربانـی نیشـان دەدرێت، ئـەی دەبێت سـزای ئـەوەی پێی وابـوو قورئـان مەخلوقـە چـی بێت؟!

# عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل

## هێرش بۆ سەر جەهمیەکان و ئەبو حەنیفە بۆ؟!

بەرلەوەی هەر شتێک بڵێین دەربارەی ڕۆڵی عەبدولای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە ژیانی باوکی، دەمەوێت باسی جەهمی و جەهمیەت بکەم بە کورتی، کەدوایی بە درێژی باسی دەکەین، چونکە ناویان زۆر دووبارە بوەوە لەو حەدیسانەی کە ئیمام ئەحمەد خەڵکی تێدا تەکفیر کردوە بەتایبەتی جەهمیەکان! مەبەستی ئیمام ئەحمەد وسەلەفییەت بە گشتی لە جەهمی ئەو کەسانەیە کە شوێنکەوتەی [الجهم بن صفوان] کە لە ساڵی ١٢٨ هیجری پاش بەژداری کردنی لە شۆڕشێک بە ڕابەری الحارث بن سریج التميمي لە دژی دەوڵەتی ئەمەوی. خۆی ئەو ئاڕاستەیە دەبوایە بە ناوی [جعد بن درهم] ی مامۆستای ناونرابا، هەتا هەندێ مێژوونووس ئاماژەیان بۆ [جەعدیەت] کردوە. بەڵام دواجا ئەو ئاڕاستە فیکری وفەلسەفیە دینییە بەناوی جەهمیەتەوە ناونرا!

سەلەفیەکان زۆر بە خراپی باسی جەهمیەکان دەکەن وسەدان درۆ و بوهتانیان دەدەنە پاڵ، و هەتا ئەو کەمە هەقیقەتەش دەربارەیان دەڵێن بە نیوە چڵی دەیڵێن! لە سەرێکیترەوەش زۆربەی هەرە زۆری سەرچاوەکانیان لە نیوبردران! یانی بە کەیفی خۆیان قسەیان لەسەر دەکەن و تۆمەتیان بۆ هەڵدەبەستن، سەرچاوەکانیشیان فەوتاندوە تا بزانین ئەوان چ دەڵێن! بۆ نمونە ئەوان تۆمەتی پەک خستنی [تعطیلی] سیفاتی خوا دەدەنە پالیان بەبێ ڕوونکردنەوە، کاتێ جەعدی کوڕی درهەم، لەسەر دەستی والیە شەلاتیەکەی ئومەوییەکان خالیدی کوڕی عەبدولڵای قەسری بە دڕەندەترین شێوە سەری بڕا لە ڕۆژی یەکەمی جەژن ولەژێر مینبەری مزگەوتدا، گووتی: خەڵکینە قوربانیەکانتان سەربڕن، خوالیتانی قبوڵ بکات، من قوربانی بە جەعدی کوڕی درهەم دەدەم، کە دەڵێت: خودا ئیبراهیمی بە خەلیل و هاوڕێ نەکردوە، و قسەشی لەگەڵ موسا نەکردوە! [إنه زعم أن الله لم يتخذ إبراهيم خليلا، ولم يكلم موسى تكليما] ببینە ئەو وەحشیەتە لە ژێر مینبەر سەری زانایەکی وا گەورە سەربڕیت کە مامۆستا

و تەربیەتدەری كوڕی خەلیفە بوو و ناسراو بوو بە زوهد و خواپەرستی!
ئیبن تەیمیە دەڵێت جەهمیەكان دەڵێن خودا قسەكانی خستە ناو دارێكەوە و لەوێوە دەردەچوون بۆ موسا، ئەوانەش بەو قسەیە كافر دەبن ئەگەر تۆبە نەكەن دەكوژرێن!
ئەو نەفیكردنەی سیفات لەلای جەعدی كوڕی درهەم و جەهمی كوڕی سەفوان وجەهمیەكان بە گشتی لەبەر تەقدیسی لە ڕادەبەدەریان بۆ زاتی خوا و بە پشت بەستن بە ئایەتی [لیس كمثلە شئ] هیچ شتێك وەك ئەو نیە، سوور بوون لەسەر دوورخستنەوەی هەموو وێكچوونێكی خودا بە مەخلوقاتی، بەو شێوەیە لێكدانەوەی تایبەتیان هەبوو بۆ سیفاتەكانی خوا، جا پێكابێتیان یان نا ئەوە بابەتێكی ترە، هەرچەندە تەنزیهو دوورخستنەوەی سیفاتی مادی وەك دەست وچاو و پێ و دانیشتن زۆر باشترە لە بەرجەستەكردنی خوام چونكە بۆجوونكردنی خوا بە جەستەیەكی گەورە و دەست وپێ وچاو و دانیستوو لەسەر عەرش وكورسیەوە، زیاتر لە بۆجوونە سەرەتاییە وەسەنیەكان نزیكە بۆ زاتی خوا.. ماقولە ئەوانە بەو تەنزیهو و تەقدیسی خوایەوە هەزار و سێ سەد ساڵ نەفرەت بكرێن و تەكفیر بكرین و وەك ئاژەڵ سەرببڕێن!؟ دوایێ زۆربەی تێزەكانی جەهم لە وەڵامی تێگەیشتنی مادیانەی سەلەفی بوو، بە تایبەتی مقاتل بن سلیمان بوو كە موجەسەمەیەكی سەلەفی بوو، تەجسیمیەتی هێندە بڕی كردبوو دەست وپێ وچاو و جەستەی بریار دەدا بۆ خوا!

## بۆ دەبێت باوەڕ بكەین ئەحمەد تەكفیرچی بووە؟!

ئەوە بابەتێكی سەربەخۆیە لە دواییدا بە درێژی باسی دەكەین خوا یار بێت. ئەوەی زیاتر وامان لێدەكات بڕوا بە دەرچوونی ئەو تەكفیراتە بكەین لە دەمی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل، عبد اللە ی كوڕی ئەحمەدی كوڕی حەنبەلە. لە كتێبی (السنة) عەبدوڵای كوڕی ئەحمەدی كوڕی حەنبەل، هێندە تەكفیری ئابڕووبەری تێدایە بۆ ئیمام ئەبو حەنیفە وكەسانی تر، هەرچەندە ئەو كتێبە بە یەكێك لە كۆڵەگەكانی عەقیدە وفیكری سەلەفییەت وحەنبەلیەت دادەنرێت لەوەتی نووسراوە، كەچی كەسانێكی بەناو [میانەڕەو] لە زانایانی حەنبەلی وسەلەفییەتی ئیحراج

کـردووه، بـەو درەنگانـە دەڵێـن ئـەو کتێبـە ناکرێـت خاوەنەکـەی عەبـدوڵای کـوڕی ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل بێـت!

وەک لـە کتێبـی (تاریـخ بغـداد ١٣|٣٧٨) دا هاتـووە کـەوا ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل لـە کۆتاییـدا بـۆی دەرکەوتـوە کـەوا زەنـی لەمـەڕ ئەبـو حەنیفـە دەربـارەی خەڵقـی قورئانـدا ڕاسـت نییـە، ابـو بکـر المـروزی دەگێڕێتـەوە: سـمعت أبـا عبـد اللـه أحمـد بـن حنبـل یقـول: «لـم یصـح عندنـا أن أبـا حنیفـة کان یقـول: القـرآن مخلـوق“ بـەڵام ئـەو ئینـکار کردنـەی هیـچ سـودێکی نیـە لەبەرامبـەر پشـت ڕاسـتکردنەوەی ئـەو خسـتنە پاڵـە لەلایـەن زانـا گەورەکانیـان وەک ( ابـی یعلـی لـە طبقـات الحنابلـە، و اللالکائـی لـە اصـول السـنة، کتێبـی (المقابلـة بیـن الهـدی والضـلال) ی عبـد الـرزاق حمـزة، والبیهقـی لـە کتێبـی الاسـماء والصفـات، وابـن الجـوزی لـە کتێبـی مناقـب الامـام احمـد و لـە کتێبـی العلـل المتناهیـە، و ابـن تیمیـە، وابـن القیـم، وشـەرحکەری العقیـدە الطحاویـە، والذهبـی . نـەک هێنـدە بەڵکـو شـێخ ابـن بـاز بـە سـەرچاوەیەکی سـەرەکی عەقیـدەی سـەلەفی دادەنێـت. هەروەهـا لـە کتێبـی «جامـع بیـان العلـم وفضلـە“ (٢|١٤٩) ابـن عبـد البـر دەگێڕێتـەوە کـەوا یحیـی بـن معیـن دەڵێـت: (کـەوا هاوەڵانمـان لـە ئەهلـی حەدیـس زۆر زیادەڕۆیـی دەکـەن لـە ئەبـو حەنیفـە وشـوێن کەوتوانـی) [أصحابنـا (أي أهـل الحدیـث) یُفْرِطـون فـي أبـي حنیفـة وأصحابـە] لـەو ڕۆژگارەش کتێـب لـە دژایەتـی وتەکفیـری ابـو عنیفـە بەردەوامـە لـە دەرچـوون. بـۆ نموونـە کتێبیکـی هاوچـەرخ بـە ناونیشـانی [ نشـر الصحیفـة فـي ذکـر الصحیـح مـن أقـوال أئمـة الجـرح والتعدیـل فـي أبـي حنیفـة] لـە نووسـینی [الشـیخ العلامـة المجـدد لهـذا الدیـن فـي الدیـار الیمنیـة الدکتـور أبـو عبـد الرحمـن مقبـل بـن هـادي الوادعـي]

کـە تایبەتـی کـردوە بـە وەڵامدانـەوەی ئـەو سـەلەفیانەی دەیانەوێـت بڵێـن ابـو حنیفـة ش ئیمامێکـی بەڕێـزی موسـڵمانانە، و ئەوانـەی قسـەیان پیگوتـوە یـان تەکفیریـان کـردوە کەمینەیەکـی کەمـن، و دەمکوتـی ئەوانـەش دەکات کـە هێـرش کردنـە سـەر ئەبـو حەنیفـە بـە هەڵـە و نەنگـی لـە قەڵـەم دەدەن! شـێخ مقبـل نـاوی سـەدان موحەدیـس و ئیمامـی سـەلەفییەت دەهێنێـت کـە قسـەی پـڕ لـە سـوکایەتی و جوێـن و تەکفیـر و تەفسـیق کـردن نەمـاوە بـە ئەبـو حەنیفـەی نەڵێتـن، هـەر لـە سـەرەتادا دەڵێـت: ” ابـن ابـی داود وەک لـە ژیننامەکـەی باسـی دەکەیـن دەگێڕێتـەوە کـە موحەدیسـەکان هاودەنگـی و ئیجماعیـان هەیـە لەسـەر جـەرح کردنـی [تانەلێدانـی]...

باسـی قسـەی ئەوانـەم نەکـردوە کـە تەعدیلیـان کـردوە [یانـی لـە تـەرازووی پێوانـدا

کێشـیان داوەتـی و ڕاسـتیان کردیتـەوە!] چونکـە ئەوانـە یـان هیـچ وەزنیـک بـۆ قسـەکانیان دانانرێت لـە تـەک ئیمامـە گەورەکانـی جەرح و تعدیل، یان لـە زیادەڕەوانی ئەبو حەنیفەن، یانیش لـە ئیمامەکانی وەک سفیان الثوري و عبداللـە بن المبارک و هاوڕێچکەکانیـان، کـە دوایی پاشگەز بوونـەوە لـە ستایش کـردن وپەسندانی، دوایی خەلکیـان لێی ئاگادارکردیتـەوە، بەڵکو تانەیـان لێداوە...بـە دەمارگرژانی ابـو حنیفـەش دەلێم هـەی جاهیلینـە تورەبوونـی نـاوێ، نازانـن ئـەوەی قسـە بـە ئەبـو حەنیفـە دەڵێت ڕکنێک لە ئەرکانی ئیسـلامی پێشـێل نەکردوە! بەو جاهیلانە دەڵێین ئێوە بە غیرەتترن لەسـەر دینـی خـوا لـە احمـد بـن حنبـل، و البخـاري و مسـلم و الـدار قطنـي و الخطيب؟ پێیـان دەڵێین ئێوە ابو حنیفە باشـتر دەناسـن لـە مالـک بـن انس و شـریک بـن عبداللـە و النخعي، و یحیی بن سـعید بن القطان، وعبداللـە بن یزید المقرئ، ابـن المعین، و سفیان الثوري و سـفیان بـن عیینـة و عبداللـە بـن المبـارک...“

ئینجـا باسـی هـۆکاری ئـەو کەسـانەش دەکات کـە قسـەیان پـێ نەگوتـوە لەترسـی ئـەوە بـوە: « چونکـە حەنەفیـەکان دەسـەڵاتی دادگا وقەزایـان بەدەسـت بـووە لـە سـەردەمانێکی زۆر، زۆر لـە ئەهلـی عیلـم نەیانتوانیـوە بـە ڕاشـکاوی نـاوی ابـو حنیفـە بهێنـن لـە کاتـی تانەلێدانـی، ئەوەتـە البیهقـي لـە مناقب الشـافعي، تانـەی ابـن ابـي حاتـم لـە ابـو حنیفـە دەگوازیتـەوە، کـە ابـن ابـي حاتـم بەڕاشـکاوی نـاوی ابـو حنیفـە دەهێنێـت، کەچـی البیهقـي دەڵێـت [ابـو فـلان] و نـاوی ابـو حنیفـە ناهێنێـت“!

”وبمـا أن الحنفيـة لهـم سـلطة القضـاء في كثيـر مـن الأزمنـة تجد كثيرا مـن أهـل العلم لا يسـتطيعون أن يصرحـوا بالطعـن في أبي حنيفـة فذلكم البيهقي في مناقب الشـافعي ينقل عـن ابـن أبـي حاتـم الطعـن في أبـي حنيفـة، فابـن أبـي حاتـم يصـرح بأبـي حنيفـة والبيهقي ينقل عنه ويقـول: قـال أبـو فـلان، ولا يصـرح بأبـي حنيفـة»

٧٨٠٩=http://waqfeya.com/book.php?bid”

خوێندنـەوەی ئـەو کتێبـە ڕشـانەوەی مـرۆڤ دەهێنێـت لـەو هەمـوو ئەئیمـە دەمپیس و نـاخ ڕەشـانەی کـە لوتکەیەکـی عەقڵانیـەت و ئـازادی وکرانـەوەی وەک ابـو حنیفـە وا پـڕ سـووکایەتی دەکـەن!

## باوکانی سەلەفییەت:

# تەکفیر و جوێن باران کردنی ئەبو حەنیفە

### تەکفیر و جوێن باران کردنی ئەبو حەنیفە

کەوابوو ئیجماعێکی سەرتاسەر هەیە لەسەر شەیتاندنی ابو حنیفە و ئەو کتێبەی عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بیدعەیەک نییە لەو بوارە، بە ئاشکرا وبەدزی تەکفیریان کردوە و هەزاران درۆ تۆمەتیان بۆ هەڵبەستوە، تەنها لەبەر ئەوەی کابرایەکی بلیمەتی خاوەن عەقڵ بوو و هێندە ئیعتیباری بۆ قال وقیلە و حدثنا دانەدەنا.

داخی گرانم دوایی شوێن کەوتە و قوتابیانی ابو حنیفە کەوتنە ژێر کاریگەری ئەو تیرۆرە فیکریەی سەلەفیەکان، ناچاریان کردن هەر خۆیان ابو حنیفە بسەلەفێنن، و زۆربەی میراتی ابو حنیفە یان دیزە بەدەرخونە کرد، لە ڕایە بە جورئەتەکان و بلیمەتەکانی، هەموو ئاوی ئەو ئیمامە گەورەیان لە ئاشی ابن حنبل وسەلەفییەت کرد، قوتابی وا تەحریفچیت نەبێت چاکترە!

لە کتێبی (السنة) عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل یەک بابێکی تایبەتی تەرخان کردوە بە ناوی ( ما حفظت عن ابي ومشايخي في ابي حنيفة) کە سەرتاسەری تانە وجوێن وتەکفیر کردنە بۆ ئەبو حەنیفە وهاوەڵانی. کە ئەوەش ناکرێت هەر عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بۆ خۆی بە دەمی باوکی هەڵیبەستبێت، چونکە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وادیارە سروشتی زۆر توند وتیژی هەبوبێت، بە ڕادەیەک لە پاش بەربوونی لە زیندان پەیوەندی لەگەڵ کەڵەزانایانی حەدیسی وەکو علی بن المدینی ویحی بن المعین پچڕاند! هەر لەبەر ئەوەی وەک التقيە دانیان بە مەسەلەی خەڵقی قورئاندا هێنا!!

تەنها ئەو کتێبەش ئەو بەزمە بە ئەبو حەنیفە ناکات بەڵکو نموونەی ئەو جۆرە کتێبانە لە ئەدەبیاتی سەلەفی زۆرن کە هەندێکمان باس کردن، کە پڕاوپڕن بە جوێن وتانەلێدان لە نەیارانیان.

عەبدولڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، ڕۆڵێکی زۆر گرنگ وترسناکی بینیوە لە ژیان و شوهرەتی باوکی، هەندێک دەڵێن لە باوکی زیرەکتر بووە لە عیلمی حەدیس، ئینجا لەوەش سەیرتر هەموو کتێبەکانی بەناوی ئیمام ئەحمەدی کوری حەنبەل نووسراوە لە پاش مردنی بە دەستی عبداللە ی کوڕی نووسراوەتەوە وبڵاوکراوەتەوە! با کەمێک لەو تانە وتەشەر وتەکفیرەی ناودارانی سەلەفی ساڵح بگوێزینەوە کە ئەحمەد بن حەنبەل گێڕایتەوە وعەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل نووسییویەتەوە، سەرەڕای زۆری بەڵگەکان و قسەکانی سەلەفی ساڵح هەوڵمان داوە نمونە بە ناودارەکانیان بهێنینەوە:

لە لاپەڕەی ١٨٠: (يؤجر المرء على بغض ابي حنيفة ( لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل م پرسی: خەڵک پاداشتی خێریان بۆ دەنوسرێت بە ڕق لێبوونەوەیان لە ئەبو حەنیفە؟ گووتی: أي واللە، ئەرێوەڵڵا!)

لە لاپەڕەی ١٨١: سألت ابا يوسف عن ابي حنيفة فقال: وما تصنع به مات جهميا (ڕای ئەبو یوسفم پرسی لەبارەی ابو حنیفە، گووتی چ کارێکت پێیەتی ئەو وەک جەهمییەک مرد) درۆ بە دەوی یەکەم قوتابی ئەبو حەنیفەش دەکەن!

لە لاپەڕەی ١٨٢: دينه ودين آباءه القول بان القرآن مخلوق (ئاینی ئەبو حەنیفە وباوکانی گوتنی قورئان مەخلوقە) بەو قسەیە بێت کێشەی خلق القران زۆر کۆنترە لەسەردەمی مەئمون ٢١٨ کۆچی!

لە لاپەڕەی ١٨٤: ابن ابی لیلی نامەی نارد بۆ ابو حنیفە گووتی تۆبە بکە لە گوتنی قوئان مەخلوقە، ئەگینا کارێکت بەسەر دەهێنم پیت ناخۆش دەبێت، یەکسەر گوێرایەڵی نیشان دا، گووتم باوکە: چۆن واتکرد، گووتی کوڕم وەک توقیە رازی بوونم نیشان دا.

لە لاپەڕەی ١٨٤: جعلوە کافرا (تەکفیریان کردوە) مەبەستی زانایانی سەلەفیە! سفیانی الثوري دەڵێت، حماد بن ابی سلیمان گووتی: بڕۆ لای ئەو کافرە مەبەستی ئەبو حەنیفەیە و پێی بڵێ: ئەگەر دەڵێیت قورئام مەخلوقە لێمان نزیک نەبیتەوە! گوێم لە حماد بن ابی سلیمان جوێنی بە ئەبو حەنیفە دەدا! [ئەوە بەڵگەیە بۆ جوێندانی شەرعی سەلەفی ساڵح]

هەر ئەو حەمادە سفیان الثوري دەڵێت گوێم لیی بوو گووتی: سەیرت بە ابی حنیفە نایەت کە دەڵێت قورئان مەخلوقە؟ پیی بڵێ: هەی کافر هەی زەندیق! [ئەگەر ڕاست بیت ئەو حەمادە توحفە بووە لە جوێندان و تەکفیرکردن، باوکێکی

مەزنـی جوێنـدان وتەکفیـرە]
لـە لاپـەڕەی ١٨٦ ئەوزاعـی دەڵێت: ئەبـو حەنیفـە ئیسـلام تـاڵ تـاڵ هەڵدەوەشـێنێتەوە!
لـە لاپـەڕەی ١٨٧ هـەر ئەوزاعـی دەڵێت: مـا ولـد فـي الإسـلام مولـود اشـر مـن أبـي حنيفـة وابـي مسـلم (لـە ئیسـلامدا کەسـی خراپتـر لـە ئەبـو حەنیفـە وئەبـی موسـلیم لـە دایـک نەبـوون) عروبەتـی سـەلەفییەت ببینـە هەردووکیـان عەرەبیـش نیـن!
هـەر ئەوزاعـی لـە لاپـەڕەی ١٨٨ دەڵێت: وانـە يخالـف الحديـث الشـريف قصـدا (ئـەو بـە ئەنقەسـت پێچەوانـەی حەدیسـی پێغەمبـەر دەکات) بەڵکـو هـەر بـاوەڕی بـە ١٥ حەدیسـێک زیاتـر نەبـوو لـە بلیمەتـی خۆیـدا.
لـە لاپـەڕەی ١٨٩: ايـوب السـختياني ابـو حنيفـەی دیـت لـە المسـجد الحـرام، کـە بـەرەو ڕووی هـات، کـە ئەیـوب دیتـی بـە قوتابیانـی گـووت: هەڵسـن بڕۆیـن بـا توشـی گـەڕ بوونـی خۆیمـان نـەکات!
گوێـم لـە ابـن عـون بـوو گووتـی: مـا ولـد فـي الإسـلام مولـود اشـأم علـى اهـل الاسـلام مـن أبـي حنيفـة (لـە ئیسـلامدا کەسـی شـومتر لەسـەر ئیسـلام لـە ئەبـو حەنیفـە خەلـق نەبووە!)
لـە لاپـەڕەی ١٨٧ لـە لاپـەڕەی ١٩٢ ئەعمـەش دەڵێت: رجـل اسـتتيب مرتيـن (دوو جـار تۆبـەی دراوە)
هـەر ئەعمـەش دەڵێت: واللـه الـذي لا الـه الا هـو مـا اعـرف مـن هـو شـر منهـم، قيـل يعنـي المرجئـة؟ قـال المرجئـة و غيـر المرجئـة! سـوێند بـە لا الـه الا هـو لـەوان خراپتـر ناناسـم، گوتیـان مەبەسـتی مورجیئەئـە؟ گووتـی مورجئـە وغەیـری مورجیئـە! [یانـی تەنهـا سـەلەفیەکانی پـێ باشـە، خەڵکیتـر هەمـووی خراپـن]
ابوبكـر بـن عيـاش دەڵێت: واللـه الـذي لا الـه الا هـو لانـا اخـوف علـى الديـن منـه مـن الفسـاق. [سـوێند بـە لا الـه الا الله ترسـم لـە دیـن لـەو –مەبەسـتی ئەبـو حەنیفـە یـە- زیاتـرە لـە فاسـقەکان]
لـە لاپـەڕەی ١٩٦: غيـر ثقـة ولا مأمـون (ئەبـو حەنیفـە جێگای متمانـە نییـە وئەمیـن نییـە) بێگومـان ئەمییـن نییـە لەسـەر خوراِفاتـی سـەلەفییەت!
لـە لاپـەڕەی ١٩٤: سـفيان الثـوري دەڵێـت فتاويـە فتـاوي اليهـود (فەتواکانـی وەە فەتـوای جووەکانـە) چـۆن جولەکـە لـە تـەک تەوراتـدا تەلمـود و میشـنایان دروسـت کـرد، سـەلەفییەت ئەحادیسـی دروسـت کـرد، کـێ فەتـوا وکاری جولەکـەی کـردوە؟!
لـە لاپـەڕەی ١٩٧: ضـرب اللـه علـى قبـر ابـي حنيفـة طاقـا مـن نـار (خـوا تەوقێکـی لـە

ئاگری خستۆتە سەر قەبری) ئەوە غەیبە بۆ منداڵ فریودان باشە!
لە لاپەڕەی ١٩٧: نبطيا استنبط الامور برأيه (نەبەتی بوو (واتە عەرەب نەبوو) بە بیروڕای خۆی بڕیاری دەدا) دیسان ڕەگەزپەرستی عروبەتی سەلەفییەت!
لە لاپەڕەی ١٩٨: سفيان الثوري دەماری عروبەتی دەجولێت و لێی دەگێڕنەوە کە باسی ابو حنیفە دەکرا، دەیگووت: ئەعوزوبیللا لە شەڕی ئەو نەبەتیەی کە ئیستیعرابی کرد، واتە بووە عەرەب! [ئەو قسەیە لە عەرەبچێتی زیاتر چیە سەلەفیەکان؟]
لە لاپەڕەی ١٩٩: مالیکی کوڕی ئەنەس دەڵێت: ما كاد أبو حنيفة إلا الدين، ئەبو حەنیفە دژایەتی تەنها لەگەڵ دین بوو[ ناگات بە یەک لە سەدا ی دوژمنایەتی سەلەفییەت بۆ دین، بەس نیە تۆپی زەویتان لە ئیسلام بێزارکردوە؟]
هەر انس بن مالک لە لاپەڕەی ١٩٩ وابو حنيفة من الداء العضال وينقض السنن (ئەبو حەنیفە نەخۆشیەکی کوشندەیە وسونەتەکان هەڵدەوەشێنێتەوە) یانی سەلەفییەت دەرمانی دەردی بێ دەرمانە؟!
هەروەها دەڵێن انس بن مالک لە یەکێک دەپرسێت: ابو حنیفە باس دەکرێت لە وڵاتی ئێوە؟ دەڵێت: بەڵێ، انس دەڵێت: دروست نییە لەو وڵاتە بژیت!! [دەبێت چ تاوانێکی گەورەی کردبێت، خۆ پێغەمبەر هاوشاری جوو و موشریک ومونافیقانیش بوو بە ئیستیلاحی ئیسلامی!؟]
لە لاپەڕەی ٢٠٢: الحمد لله الذي كبس به بطن الأرض (سوپاس بۆ خوا چوە ژێر گڵ) بیری بچوک و کورتبینەکان!
لە لاپەڕەی ٢٠٣: شریک بن عبدالله گووتی: لأن يكون في كل ربع أرباع الكوفة خمار يبيع الخمر خير من ان يكون فيه من يقول بقول أبوحنيفة. (لە هەر گۆشەیەکی ئەو کوفەیە مەیخانەیەک هەبێت ومەی بفرۆشێت چاکترە لەوەی کەسێکی تێدا بێت پەیڕەو لە وتەکانی ئەبو حەنیفە بکات) دەڵیی لەسەر سەلەفییەتیان گوتووە! بەخوا لە شارەکان مەیخانەکان باشترن لەو شوێنانەی بیری تۆپیوی ترسناکی سەلەفییەت بڵاودەکەنەوە.

## کە تەکفیر و جوێن دەبێتە پیشەی سەلەفیەکان

هەر لەو کتێبەی السنة و لە کتێبی (مسائل الامام احمد بن حنبل واسحاق بن راهوية) یش ڕووداوی سەردانی ئەبو حەنیفە بۆ الاعمش دەگێڕێتەوە کە زانایەکی گەورەی ئەهلی حەدیسە واتە لە باوکانی دامەزرێنەری سەلەفییەتە، ئەو ڕوداوە گوزارش دەکات لەو پەڕی بێ زەوقی وبێ ویژدانی بەرامبەر کەسانێکی غەیرە سەلەفی، با لە ئاستی ئەبو حەنیفەش بێت، لەوەدا بۆت دەردەکەوێت کە هیچ جۆرە دۆستایەتیەک و پەیوەندیەکی مرۆییانە قابیلی دروست بوون نییە لە نێوان سەلەفیەک و دینداریکی نا سەلەفی کە لەسەر بیروڕاکانی ئەو نەبێت، چونکە ئەوان سەلەفییەت بە دینی هەقیقی و ڕەهای خوایی دەزانن، مەلا عبداللطیف ی مەدخەلیش گوێم لێبوو دەیگووت برایان ئەگەر نەزانین ١٠٠٪ ئەوەی ئێمە لەسەرینە دینی خوایە، نەک ٩٩٪، قەت ئەو ئیدیعایە ناکەین!

دەڵێن ئەبو حەنیفە کە دەزانێت (ئەعمەش) نەخۆش کەوتوە سەردانی دەکات وبەو پەڕی ڕەوشتی بەرزیەوە پێی دەڵێت:

باوکی محمد ئەگەر بارگرانیت بۆ دروست نەکەم هەموو ڕۆژێک دەهاتمە سەردانت، ئەعمەش لە جیاتی ئەو ڕەوشتە بەرز وشارستانییەی ئەبو حەنیفە وەڵامی دەداتەوە ودەڵێت: بەخوا تۆ بارگرانی بەسەر من هەتا کاتێک لە ماڵەکەی خۆت دانیشتویت!! ئەی چۆن دەبێت ئەگەر هەموو ڕۆژێک سەردانم بکەیت؟! (والله انک لتثقل علي وانت في منزلک فکيف اذا عدتني!(

هەر ئەو ئەعمەشە موبارەکە وتەیەکی بێ زەوقتر دەربارەی ئەبو حەنیفی دەڵێت، کە لە ڕەوشتی یەکێک ناوەشێتەوە خۆی بە زانا دابنێت، ئەو زاتە موبارەکە دەڵێت: نمونەی ئەبو حەنیفە وەک یەکێکە لەشەو چوبێتە دەرەوە وڕەشایەک ببینێت لەو وایە خورمایە، کەچی پیسایی سەگە!! (انما مثل ابو حنيفة مثل رجل خرج بالليل فرأى سوادا فظن انها تمرة، فأن اخطاه فيکون غير ذلک، کان خر وکلب(

لە لاپەڕەی ٢٠٤هارون بن سفيان دەڵێت: أصحاب أبي حنيفة جرب (هاوەڵانی ئەبو حەنیفە گەڕن یان گوڕین بە هەولێری(

هەر هارون دەڵێت: گوێم لە شریک بوو گووتی: ئەبو حەنیفە دووجار تۆبەی لە کوفر پێکراوە، لەگەڵ قسەکانی جەهم و ئیرجا!
سفیان الثوري یش دەڵێت: ئەبو حەنیفە دووجار تۆبەی لە کوفر و قسەی زەندیقان پێکراو!
لە لاپەڕەی ٢٠٨: ذكرُ ابي حنيفة في المسجد مصيبة عظيمة (ناوهێنانی ئەبو حەنیفە لە مزگەوت گوناهێک و کارەساتێکی گەورەیە) بە قەد کارەساتی ابن حنبل و ابن تيمية و ابن عبدالوهاب نابێت!
لە لاپەڕەی ٢٠٩: ابو حنيفة فاسد (ئەبو حەنیفە فاسیدە) قەل بە قەل دەڵێت ڕووت ڕەشە!
لە لاپەڕەی ٢١٥ ما رأيت اجرا على الله من أبي حنيفة (کەسم بە جورئەتر بەرامبەر بە خوا لە ئەبو حەنیفە نەدیوە) منیش کەسم بە جورئەتر بەرامبەر بە خوێنی بەندەکانی خوا لە سەلەفییەت نەدیوە، بە جۆرێک مرۆڤ دەکوژن و سەردەبڕن بۆ ئاژەڵیش بەو جۆرە گوناه و تاوانە!
لە لاپەڕەی ٢١٩ يقول عن ابي حنيفة انه كان يقول "إيمان ابي بكر وإيمان ابليس واحد" (ئیمانی ئەبوبەکر وئیبلیس وەک یەکە) مەکینەی درۆی سەلەفییەت!
لە لاپەڕەی٢٢٢ سود الله وجه ابو حنيفة ومن يقول بقوله (خوا ڕووی ئەبو حەنیفە وئەوەشی قسەی ئەویشی پێ ڕاستە ڕەش بکات) دیارە کێ ڕوو ڕەشە لەو جیهانە، خەریکە ڕووی هەموو موسڵمانان ڕەش دەکەن سەلەفیەکان!
ئەمەو تورەهاتی تری زۆرتر وەک (ئەبو حەنیفە باوکی تاوانبارانە) ولە دزوجەردە زیانبەخشترە لەسەر موسڵمانان، و ئەبو جیفەیە(أبو جيفة!!) واتە لاشە و کەلاکی بۆگەن، نابێت موسڵمان لە شوێنێک نیشتەجێ بێت ناوی ئەبو حەنیفەی لێ بهێنرێت (لا يسكن البلد الذي يذكر فيه أبو حنيفة؟!)، ئەگەر تاوانەکانی بەسەر ئومەتی ئیسلام دابەش بکرێت بەشیان دەکات، دەبێت وەک یەکێکی گەڕ و گوڕی خۆتی لێ بپارێزیت (يجب اعتزاله كالأجرب المعدي بجربه)
نا مروەتیان بەوە دەگات بە مردنی ئەبو حەنیفە خۆشی و پێ خۆشبوون نیشان دەدەن، بڵێی دڵ ڕەشتر هەبێت لە دڵی ئەو سەلەفیانە!؟ لەسەر چەند خیلافێکی دینی وا ئیمامێکی گەورەی موسڵمانان بشەیتانێنی!

## دڵخۆشبوون بە مردنی زانایەکی وەك ئەبو حەنیفە!

ڕیوایەتەکە دەڵێت هەندێ لە زانایان شوکری خوایان کرد بە بیستنی مردنی ئەبو حەنیفە
( بعض العلماء حمدوا الله عندما سمعوا بوفاة أبي حنيفة) وزۆر لە زانایان ڕازین بە لەعنەت کردن لە ئەبو حەنیفە (أن كثيراً من العلماء على جواز لعن أبي حنيفة)
عەبدوڵای کوڕی موبارەک هەتا گومان دەخاتە زانست و عیبادەتیشی، هەرچەندە ئەبو حەنیفە زۆر ناودارە بە کۆششکردنی لە عیبادەت، یەکێک لای باسی شارەزایی ئەبو حەنیفە دەکات لە عیلمی حەدیس و لە عیبادەت، عبدالله ابن المبارک، مەلا مەعاز گووتەنی بە تووندرەویەوە پیی دەڵێت: دەربارەی شارەزایی لە حەدیس ئەو کەسە شایستە نەبوو لەو عیلمە وەک تۆ دەڵێی، من بە نهێنی دەچومە مەجلیسی!
دەربارەی عیبادەتی زۆریشی ئەوەش وانەبوو، چونکە زۆر چالاک بوو بەیانیان لە باسی مەسایلەکان تا دەگەیشتە ئێوارە وا چالاک بوو، ئەوەی عیبادەتکەر و شەونخونیکەر بێت بەیانیان بێ تاقەت وکزە! بۆیە دەڵێن موسڵمانی سەختگیر هەردەم تەمەڵە! ئەوە سەیری پێ دێت ئەبو حەنیفە چوست وچالاک بووە!
ابن المبارک لە کاتێکدا ماڵەکەی پڕە لە ئەسحابی حەدیس باسی چەند حەدیسێک دەکات لە مەسەلەیەکدا، کابرایەک دەڵێت ئەبو حەنیفە ڕای جیاوازە لەو بابەتە! ئیبن موبارەک توڕە بوو و گووتی: من حەدیسی پێغەمبەرت بۆ دەگێڕمەوە، تۆش باسی پیاوێکم بۆ دەکەیت کە شمشێری پێ ڕەوابوو لەسەر ئومەتی محمد د.خ! جارێکی تر دەڵێت ئەبو حەنیفە مورجیئە بوو و شمشێری پێ ڕەوا بوو!
ئاستی قسە پیگووتن و جنێودان دەگاتە ئەو ڕادەیەی لە شەعبیترین گەڕەک گوێت لە قسەی ئەو سەلەفی ساڵحانە نابێت: عبداللە دەڵێت: من هاوەڵانی ئەبو حەنیفە لای من وەک ئەو دەفلێدەرانەن یان دمبکچیانەن، ئەگەر یەکێکیان پاشەڵی رووت کرد لە مزگەوت، گویی پێ نادات خەڵک بیبێنێت! [ ما شبهت اصحاب ابي حنيفة الا بمنزلة الدفافين لو ان رجلا كشف استه في المسجد ما بالى من رآه منهم.]
ئەمەو نمونەی تری زۆر لەو ئەلفازە ناشیرنانەی کە بە پێی کتێبەکەی عبدالله

ی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە دەمی سەلەفی سالّح دەرچوە، لە دەمی خراپترین پیاوخراپ دەرناچێت، سەیرە کە بە دەست وپەنجەی عەبدوڵای کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەگوێزرێتەوە، کە ئەویش ئیمامێکە لە ئیمامەکانی سەلەفییەت، وابزانم ئەوی لەسەرتاوە ئەو نوسینەی خوێندبێتەوە ئێستا پێی سەیر نابێت ئەو هەموو جوێنی سوک و دەمپیسی و بوغز وغەدر وپیاوکوشتن وسەربڕینەی بەردەم کامێرا لەو سەلەفیانە دەربچێت!

ئەو عبداللە یە هێمایەکی گەورەی سەلەفیە حەنبەلیەکان بوو، کە هەموو زانست و عیلمی حەدیسی باوکی نووسیەوە، ئەو پیاوە لەلایەن النسائي و الدار قطني و البغدادي و الذهبي و جەندینی تر، لە ئیمامەکانی ئەهلی حەدیس تەوسیق کراوە ومتمانەی پێدراوە! عبداللە هەر لە سەرەتای هەڵمەتەکەی دژی ئەبی حەنیفە دەڵێت کەوا باوکی، یەعنی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل بنەمای هاوەڵێتی لەگەڵ هاوەڵانی لەسەر دوو پایە بنیات نابوو:

یەکەم: متمانەی بە هاوەڵانی نەبوو تەنها ئەگەر ڕقیان لە ئەبو حەنیفە ببوایەوە و قسەکانیان ڕەت کردبایەوە وەک لە لاپەڕەی ١٨٠لە یەکەم ڕیوایەت دا دەڵێت: سمعت أبي (ابن حنبل) يقول: عن عبد الرحمن بن مهدي، أنه قال: «من حسن علم الرجل أن ينظر في رأي أبي حنيفة»..(السنة ٢٢٧)

گوێم لێبوو باوکم دەیگووت لە چاک زانایی وعیلم چاکی پیاو ئەوەیە ڕای ئەبو حەنیفە ڕەت بکاتەوە!!

دووەم: مەزهەبەکەی لەسەر ڕق لە ئەبو حەنیفە و خەڵکیتری ئەهلی عەقڵ و دین بنیات نابوو، وەک لە لاپەڕەی ١٨٠ باسمان کرد پێشوو: دەڵێت: (لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل م پرسی: خەڵک پاداشتی خێریان بۆ دەنوسرێت بە ڕق لێبوونەوەیان لە ئەبو حەنیفە؟ گووتی: أي واللە، ئەرێوەڵڵا!) یانی مەجالی بە درۆخستنەوەی تێدا نییە، ئەو ڕیوایاتانەشی کە باسی قسەی باشی سەلەفی سالّح دەکەن لەسەر ئەبو حەنیفە، هەمووی دروستکراوە و درۆیە پاش سی سەد ساڵ لە ٥٠٠ دەکانی کۆچی دانراون.

بەشی سێیەم

**بەربەهاری: نمونەی باڵای مرۆی توندڕەوی سەلەفی**

**یاسای ئیمان Credo**

**کتێبێکی تری پیرۆز لەگەڵ قورئان!**

**پێوەرێک بۆ پێوانی خەڵکی بیدعەچی!**

**پەسـند کـردن لەسـەر بنچینـەی سـەلەفی بـوون نـەک دینـداری وخووڕەوشـت!!**

**دابڕانی سەرتاسەری لەگەڵ ئەوانەی سەلەفی نین!!**

**ئیبن تیمیە وناسیبیەت و سەلەفییەت وعروبەت**

**جیهادی قەبر! ئیبنول تەیمیـە (٦٦١-٧٢٨هـ) بایەخـە بچوکەکانی ژیانـی ڕۆژانەی**

**ناسیبیەت لە ڕونترین شێوەدا!**

**ئیبن تەیمیە پێشێلی بنەماکانی سەلەفیەت دەکات!**

**پێشێلی حەدیسی سەحیحی بوخاریش!**

**دەمارگرژی بۆ ابن تیمیە**

**ئایە ئیبن تەیمیە ی باوکی توندوتیژی سەلەفیزم کورد بوو؟!**

**ابن تیمیە وسەلەفییەت وعروبەت...**

# بەربەهاری: نمونەی باڵای مرۆی توندڕەوی سەلەفی

ناوی (الحسن بن علی بن خلف ابو محمد البربهاری) یە(٢٣٣- ٣٢٩ هـ)، یەکێکە لە هەرە کەسە بەناوبانگەکانی، کە بەژداریەکی زۆر کاریگەریان هەبوە لە دامەزراندنی تیۆری سەلەفییەتی توندڕەو. کە ژیاننامەی دەخوێنیتەوە هەست دەکەیت ئەو پیاوە هیچ کارێکی نەبوە جگە لە جۆشدانی فیکری توندڕەو وتەکفیری سەلەفییەت نەبێت. دانەری (طبقات الحنابلة) دەگێڕێتەوە:"

وسمعت أخي القاسم -نضر الله وجهه- يقول: « لم يكن البربهاري يجلس مجلساً إلا ويذكر فيه أن الله عز وجل يقعد محمداً صلى الله عليه وسلم معه على العرش .[١]

"بەربەهاری لە هەر مەجلیسێک دانیشتبا دەیگوت خوای گەورە محەمەد لەگەڵ خۆی دادەنێشێنێت لەسەر عەرش"

ئەوە دەقە وەک ئەو قسەیەی سەلەفیەکانی ئەو سەردەمەی خۆمانە کە سەر زبان وبن زبانیان (خوا لەسەر عەرشەکەیەتی لە ئاسمان) کەس نازانی دەبێت گوتنی ئەو قسەیە لە هەموو مەجلیسێک سودی چی بێت؟! تەنها سودێکی هەبێت وروژاندنی کەسانی ترە لەوانەی بە شێوەیەکی تر بۆ ئەو مەسەلە عەقایدیانە دەڕوانن.

هەوڵەکانی بەربەهاری سەری لە ئاشوب وفیتنەیەکی گەورە دەرکرد لە ساڵی ٣٢٩ هیجری لە نێوان سونە وشیعە، بە مەبەستی ڕوخاندنی مزگەوتی براسا (براثا) ی شیعەکان، پاش ئەوەی جاری پێشو لەسەر دەستی خەلیفەی عەباسی المقتدر بالله ڕوخێنرا وەک ابن الجوزی لە (المنتظم في تاريخ الملوك والامم) دا باسی دەکات. بەربەهاری هێندە متمانەی بە مەسلەک وڕێبازی خۆی هەبوە بە جۆرێک هانی شوێن کەوتوانی خۆی دەدا کە بە هیچ شێوەیەک قسە وهەڵسوکەوت لەگەڵ ئەوانی تر نەکەن کە ئەو ناویان دەنێت بە ئەهلی بیدعە!

نەک هێندە بەڵکو هێندە توند وتوش بوە هەتا بە لوت بەرزی ڕەفتاری لەگەڵ زانایانی لە خۆشی گەورەتر وشارەزاتر دەکرد، بۆ نمونە وەک (ئەبو لحەسەنی ئەشعەری). دانەری کتێبی (طبقات الحنابلە) ئەو ڕوداوە دەگێڕێتەوە:

"قرأت على علي القرشي عن الحسن الأهوازي قال: سمعت أبا عبد الله الحمراني يقول: لما دخل الأشعري إلى بغداد جاء إلى البربهاري فجعل يقول: رددت على الجبائي وعلى أبي هاشم ونقضت عليهم وعلى اليهود والنصارى والمجوس وقلت

لهم وقالوا وأكثر الكلام في ذلك فلما سكت، قال البربهاري: ما أدري مما قلت قليلاً ولا كثيراً ولا نعرف إلا ما قاله أبو عبد الله أحمد بن حنبل قال: فخرج من عنده وصنف كتاب"الإبانة" فلم يقبله منه ولم يظهر ببغداد إلى أن خرج منها ."[٢]

"كاتێک ئەشعەری هاتە بەغدا چو بۆ لای بەربەهاری، دەستی بە قسان کرد ودەیگوت: وەڵامی ئەبو عەلی ئەلجەبائی و عەلی کوڕی هاشمم دایەوە، وبەربەرچی ئەوان وجوو ومەسیحی ومەجوسیم دایەوە، من وام وت وئەوان وایان وت، وزۆر لەو بارەیەوە قسەی کرد (وەک بڵێی زانایەکی گەورەی وەک ئەشعەری پێویستی بە ماستاو کردن بێت بۆ ئەو بەربەهارییەی کە بەقەد یەک لە سەدای ئەشعەری ناوبنگ وعیلمی نەبوە)، کاتێک بێدەنگ بوو، بەربەهاری گوتی: ئەوەی گوتت، نە کەم، نە زیاد هیچیان نازانم، جگە لەوەی باوکی عەبدوڵا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وتویەتی (نەک پێغەمبەر) هیچ نازانین. ئینجا گوتی: لە لای ئەو دەرچوو وکتێبی (الابانە) ی نوسی، بەڵام ئەویشی لێ قبوڵ نەکرد، وئیتر بەولاوە ئەشعەری لە بەغدا بەدیار نەکەوت تا لێی دەرچوو!" [٣]

ئەگەر ئەو هەواڵە هەڵبەستراویش بێت، کە لە موبالەغاتی سەلەفی دەچێت، بەڵام ئەگەر هەڵبەستراویش بێت، ئەوە گوزارش دەکات لەو عەقڵیەتەی کە بەو پەڕی سوکیەوە دەڕوانێتە موخالیفەکانی لەناو بازنەی هەمان دیندا. ئەگەر نا چۆن خەڵک ڕەفتار لەگەڵ زانایەکی پایەبەرز وبلیمەتی وەک ئەشعەری دەکات بەو شێوەیە لووتبەرزییە؟! نەک ئەوەش هەتا ئەو کتێبەشی (الابانة) ی لێ قبوڵ ناکات کە گوایە ئەشعەری وەک پەشیماننامەیەک نوسیویەتی لە پاش تەبەنا کردنی سەلەفییەت، وسەلەفیەکان تا ئەمڕۆش بەو پەڕی حەماسەتەوە پێشوازی لێدەکەن لە ئەدەبیاتەکانیاندا.

من لە بنەڕەتدا لەو باوەڕەدلم ئەو هەواڵە هەڵبەستراوە، یان بە لایەنی کەمەوە موبالەغەی تێکراوە، چونکە ئەو موبالەغەتانە زۆر باوە لە ناو عەقلیەتی سەلەفییەت وەک بۆ نمونە پژمینێکی بەربەهاری هێندە گەورە دەکەن و دەڵێن «في صفر سنة ثلاث وعشرين وثلاثمائة وفي هذه السنة ازدادت حشمة البربهاري وعلت كلمته وظهر أصحابه وانتشروا في الإنكار على المبتدعة فبلغنا أن البربهاري اجتاز بالجانب الغربي فعطس فشمته أصحابه فارتفعت ضجتهم حتى سمعها الخليفة وهو في روشنه فسأل عن الحال، فأخبر بها فاستهولها"[٤]

"پێمان گەیشتەوە کە بەربەهاری بەلای ڕۆژئاوادا تێدەپەڕی وپژمی، وشوێن

کەوتوانـی وەڵامـی پژمینەکەیـان دایـەوە، بـە جۆرێـک دەنگیـان بـەرز بـۆوە هەتـا گەیشـتەوە گوێچکەی خـودی خەلیفە، کاتێ پرسـیاری کرد ئـەو هەرایـە چییـە وچـی ڕویداوە؟ پێیان گوت –ئەوە پژمینی موبارەکی بەربەهاریە خەڵک یرحمک الله پێ دەڵێـن!– وزۆری پێـی گـەورە بـوو»

## یاسای ئیمان Credo

بەربەهـاری یاسـایەکی ئیمانـی Credo نوسـیوە لەمـەر عەقیدەی سـەلەفییەت بەنـاوی (السـنة) هەمـان ئـەو تونـد وتیژیـە وسـوک سـەرنجدانەی ئیمامەکانـی سـەلەفییەتی وەک ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل دووبـارە دەکاتـەوە، ئـەو عەقیـدە قەویمـە یـان یاسـای ئیمانـە چاکتریـن گـوزارش کـەرە لـە چونیەتـی بیرکردنـەوە وبیروبـاوەڕی ئەو پاسـەوانەی ئیمانـە، بۆیە هەوڵدەدەین چەند لایەنێکی وەک نمونـە بخەینە ڕوو: بەربەهـاری لـە یاسـای ئیمانەکـەی زۆربـەی بیروڕاکانـی ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل دوبـارە دەکاتـەوە، بۆ نمونـە لـە ژمـارە ۱۰۱ی عەقیدەکـەدا دەڵێت:

۱۰۱ – وقـال بعـض العلمـاء منهـم أحمـد بـن حنبـل : الجهمـي كافـر، ليـس مـن أهـل القبلـة، حـلال الـدم، لا يـرث ولا يـورث، لأنـه قـال : لا جمعـة و لا جماعـة، ولا عيديـن، ولا صدقـة "[٥]

ئەو ڕیوایەتـە وچەندینی تـر لـە بابەتی ئەحمـەدی کوڕی حەنبەلی پێشـودا وەرمـان گێڕاوەتـەوە سـەر کـوردی.

لـە ژمـارە ۱۰۲ دەڵێـت (بزانـە بیدعـە هەرگیـز نەهاتـوە تەنهـا لـە کەسـانی هەرچـی وپەرچـی وهەمەجـی وشـوێن کەوتـەی هـەر بانگێکی ئاشـوب وفیتنە نەبێت، ئەوانـەی لـەگڵ هەڵکردنـی هەربایـەک دەچەمێنـەوە، ئەوەشـی وا بێـت دینـی نییـە)

" ۱۰۲ – واعلـم أنـه لـم تجـيء بدعـة قـط إلا مـن الهمـج الرعـاع أتبـاع كل ناعـق، يميلـون مـع كل ريـح، فمـن كان هكـذا فـلا ديـن لـه."[٦] ئـەو وەسـفەش دەقـاودەق لـە وتەیەکـی عەلـی کوڕی ئەبـو تاڵیبدا هاتوە کـە دەڵێت (: النـاسُ ثلاثـةٌ: عالِـمٌ ربَّانـيّ، ومُتَعَلِّـم علـى سَـبيلِ نَجـاةٍ، وهَمَـجٌ رَعـاعٌ أَتْبـاعُ كلِّ ناعـق)

بەربەهـاری پێـی وایـە ئـەوەی تەنهـا سـونەتی پێغەمبـەر وهاوەڵانـی وجەماعەتـی ئەهلـی سـونە جێبەجێ بکات ئـەوە سـەردەکەوێت بەسـەر ئەهلـی بیدعـە، وجەسـتەی

دەحەسێتەوە....چونکە گوایە پێغەمبەر وتویەتی: نەکەن قوڵببنەوە (!) یان قسەی زل زل بکەن، دەستبگرن بە دینی دێرینتان)

" ومن اقتصر على سنة رسول الله صلى الله عليه وسلم وما كان عليه أصحابه والجماعة، فلَج على أهل البدعة كلهم، واستراح بدنه، وسلم له دينه إن شاء الله، لأن رسول الله صلى الله عليه وسلم قال : ستفترق أمتي. وبين لنا رسول الله صلى الله عل يه وسلم الناجي منها فقال : ما كنت أنا عليه اليوم وأصحابي . فهذا هو الشفاء والبيان، والأمر الواضح، والمنار المستنير، وقال رسول الله صلى الله عليه وسلم : إياكم والتعمق، وإياكم والتنطع، وعليكم بدينكم العتيق "[٧]

تا ئێرە هیچ کێشەیەکی وا نییە:

بەڵام دەمارگرژی بەربەهاری هێندە سەر دەکات، بە ڕادەیەک پێی وایە هەموو گروە ومەزهەبەکان گومڕان وبۆ دۆزەخ دەچن یەکیان نەبێت، ئەویش ئەوانەن کە باوەڕیان بەو کتێبەی ئەو (السنە) هەیە، ولە دڵەوە باوەڕی پێ هەبوو بەبێ گومان. ئەو کەسە دەبێتە خاوەنی سونەت، وئەویش لە ناجی وسەرفرازەکانە ئینشاللا. لەسەرەتادا وامزانی مەبەستی قورئانە کەچی پاش دوبارە بوونەوەی لە چەندین شوێن زۆر بە ئاشکرا بۆم دەرکەوت کە مەبەستی کتێبی (السنە) ی خۆیەتی!!

"١١٠ - واعلموا رحمكم الله أن أصول البدع أربعة أبواب : انشعب من هذه الأربعة إثنان وسبعون هوى، ثم يصير كل واحد من البدعة يشعب، حتى تصير كلها إلى الفين وثمان مائة قالة، وكلها ضلالة، وكلها في النار، إلا واحدة وهو من آمن بما في هذا الكتاب ، واعتقده من غيرريبة في قلبه ولا شكوك، فهو صاحب سنة، وهو الناجي إن شاء الله ."[٨]

## کتێبێکی تری پیرۆز لەگەڵ قورئان!

بەو یاسا ئیمانیانەی کە وەک بیدعەیەک لەسەر دەستی چەند زانایەکی سەلەفی، وچەند خەلیفەیەکی عەباسی، وەک موتەوەکیل وموقتەدیر بیللا وبەربەهاری وئیبنول بەتە وابن تیمیە وکەسانی تر دەرچوو، ئاکامێکی زۆر ترسناکی لێکەوتەوە، ئەویش ئەوە بوو ئەو دەقە نوسراوانەی دەستی ئەو کەسانە، زاڵکران بەسەر

دەقی ڕەسەنی سەرەکیش، وبەڵکو ئیلتیزام کردن بەو دەقە نوسراوانە پێشخرا بەسەر ئیلتیزام کردن بە دەقی یەکەمی ڕەسەن. بۆیە بەربەهاری بەو پەڕی متمانەوە دوبارە وسێبارە دوپات و جەخت دەکاتەوە لەسەر گرنگی کتێبەکەی، وبەڵکو تەشبیهی دەکات بە قورئان کە نابێت گومان لەیەک حەرفی بکرێت، چونکە ئەوەی گومانی بەیەک حەرفی کتێبەکەی ئەوی برد ئەوە بێ دینە:

وعليك بالتصديق والتسليم والتفويض والرضى لما في هذا الكتاب ، ولا تكتم هذا الكتاب أحدا من أهل القبلة فعسى يرد الله به حيرانا عن حيرته، أو صاحب بدعة عن بدعته، أو ضالا عن ضلالته، فينجو به، فاتق الله، وعليك بالأمر الأول العتيق ، وهو ما وصفت لك في هذا الكتاب، فرحم الله عبدا ورحم والديه قر أ هذا الكتاب ، وبثه، وعمل به، ودعا إليه،واحتج به ، فإنه دين الله ودين رسول الله صلى الله عليه وسلم ،فإنه من استحل شيئا خلاف ما في هذا الكتاب ، فإنه ليس ي دين لله بدين ، وقد رده كله ، كما لو أن عبدا آمن بجميع ما قال الله تبارك وتعالى إلا أنه شك في حرف ، فقد رد جميع ما قال الله تعالى ، وهو كافر "[٩]

ئینجا زۆر ڕاشکاوانە ئەو یاسای ئیمانە دەکاتە قورئانێک وهەمان ئەو دەستەواژانەی کە بۆ قورئان بەکار دێت ئەو بۆ نوسراوەکەی خۆی (السنه) بەکاری دەهێنێتەوە، دەڵێ:

" فمن أقر بما في هذا الكتاب وآمن به واتخذه إماما، ولم يشك في حرف منه، ولم يجحد حرفا واحدا، فهو صاحب سنة وجماعة كامل قد اكتملت فيه السنة، ومن جحد حرفا مما في هذا الكتاب، أو شك في حرف منه، أو شك، أو وقف، فهو صاحب هوى"[١٠]

## پێوەرێک بۆ پێوانی خەڵکی بیدعەچی!

بەربەهاری پێوەرێکی سادە وئاسان دادەنێت بۆ شوێن کەوتوانی بۆ ئەوەی نەکەونە ژێر کاریگەری ئەهلی بیدەع بە قەولی خۆی، دەڵێت: ( ئەگەر گوێت لە پیاوێک بوو گوتی: فلان کەس تەشبیهییە (موشەبیهە)، وفلان کەس دەربارەی تەشبیە دەدوێت، تاوانباری بکە وبزانە کابرایەکی جەهمییە. ئەگەر گوێت لە پیاوێک بوو گوتی: فلان کەس ناسیبییە، ئەوە بزانە کە خۆی رافیزییە (شیعییە).

ئەگـەر گوێـت لـە پیاوێـک بـوو گوتـی: باسـی تەوحیـد بکـە، وتەوحیـدم بـۆ شـەرح بکـە، بزانـە ئـەوە خەواریجێکی موعتەزیلییە، یان گوتی: فلان کـەس ئیجبارییـە یان باسـی جەبر – ئەوانـەی پێیـان وایـە هەمـوو کردەوەکانمـان لەسـەرمان سـەپاندراوە بـە ئیجبـاری -، یـان باسـی دادپـەروەری وعەدلـی کـرد، ئـەوە لێـت مەعلـوم بێـت ئـەو کەسـە قەدەرییـە، چونکـە ئـەو ناوانـە نوێکـردەن، وخەڵکـی خـاوەن هـەواکان دروسـتیان کـردوون)

”وإن سـمعت الرجـل يقـول : فـلان مشـبه، وفـلان يتكلـم فـي التشـبيه، فاتهمـه واعلـم أنـه جهمـي، وإذا سـمعت الرجـل يقـول : فـلان ناصبـي ،فاعلـم أنـه رافضـي، وإذا سـمعت الرجـل يقـول : تكلـم بالتوحيد، واشـرح لـي التوحيد، فاعلـم أنـه خارجـي معتزلـي، أو يقـول : فـلان مجبِـر أو يتكلـم بالإجبـار، أو يتكلـم بالعـدل، فاعلـم أنـه قـدري، لأن هـذه الأسـماء محدثـة، أحدثهـا أهـل الأهـواء“[١١]

## پەسـند کـردن لەسـەر بنچینـەی سـەلەفی بـوون نـەک دینـداری وخووڕەوشـت!!

بەربەهـاری هەنگاوێکـی تـر دەنێـت بـەرەو لوتکـەی تونـدڕەوی، کاتێـک زۆر بـە شـێوەیەکی سـەیر ودوور لـە هەمـوو بەهایەکـی ئینسـانی و دینـی و قورئانـی‌ش، کـە هەتـا ستایشـی دینـداری وئەمانـەت وچەندیـن سـیفاتی چاکـی غەیـرە موسـڵمانیش دەکات، دەڵێت: (ئەگـەر پیاوێکـی ئەهلـی سـونەت – واتـە سـەلەفی مەشـرەب – دیـت مەسـلەک ومەزهەبـی خـراپ بـوو، وفاسـیق وفاجیـر بـوو، وزۆر گوناهکـەر بـوو وگومـڕا بـوو بـەڵام لەسـەر ڕێگای سـونەت بـوو – واتـە هـەر بـە نـاو – هاوەڵێتـی بکە، ولەگەڵـی دانیشـە، وگوناهەکانـی ئـەو زیانیـان بـۆ تـۆ نییـە – ئـەی چـی لـە حەدیسـی ( المـرء علـى ديـن خليلـه ) دەکەیـت؟! - . ئەگـەر پیاوێکـی تـرت دیـت هـەردەم خەریکـی خواپەرسـتی بـوو، وچـاوی لـە دونیـادا نەبـوو، وکاروپیشـەی عیبـادەت بـوو بـەڵام لـە ئەهلـی ئەهـوا بـوو، لەگەڵـی دامەنیشـە، وگـوێ بـۆ قسـەکانی مەگـرە، ولەگەڵیـدا بەڕێگادا مەچـۆ، چونکـە مـن بـە دوری نازانـم ڕێگای ئـەوت بـۆ شـیرین بێـت، ولەگـەڵ ئـەودا بفەوتێیـت.

” وإذا رأيـت الرجـل مـن أهـل السـنة رديء الطريـق و المذهـب، فاسـقا فاجـرا، صاحـب

معاصي ضالا وهو على السنة، فاصحبه، واجلس معه، فإنه ليس يضرك معصيته، وإذا رأيت الرجل مجتهدا في العبادة متقشفا محترفا بالعبادة صاحب هوى، فلا تجالسه، ولا تقعد معه، ولا تسمع كلامه، ولا تمش معه في طريق، فإني لا آمن أن تستحلي طريقته، فتهلك معه "[١٢]

هەر بۆ زیاتر بەهێزکردنی قسەکانی نمونە بە یەکێک لە باوکانی سەلەفییەت دەهێنێتەوە ودەڵێت: ( یونسی کوڕی عوبێد کوڕەکەی دیت لە ماڵی خاوەن هەوایەک – واتە غەیرە سەلەفی – دەردەچوو، گوتی: کوڕەکەم، پێم خۆشترە بتبینم لە ماڵی نێرەموکێک دەرچیت – نازانم نێرەمۆک بۆ وا نەگریس وێنا دەکرێت – نەک لە ماڵی فلان کەس و فلان کەس. بچیتەوە لای خوا وەک زیناکەر وفاسیق ودز وخائین، پێم خۆشترە بگەڕێتەوە لای بە قسەی فلان وفلانەوە. نا بینیت یونسی کوڕی عوبێد زانیویەتی کە نێرەموک کوڕەکەی لە دینەکەی گومڕا ناکات، بەڵام بیدعەچی گومڕای دەکات تا بەرەو کوفری دەبات!!!)

تەسەور کە زیناکەر وخائین وفاسیق ودز چاکتر بێت لە پیاوێکی خواناس وماندوی کۆڕی عیبادەت، هەر لەبەر ئەوەی لە چەند لقێکی بیروباوەڕ لەگەڵ سەلەفیەک یەک ناگرێتەوە. چونکە دەمارگرژی بەیەک میکانیزم کار دەکات، بۆیە بەودوایانە مەلایەکی ناوداری شیعەکان هەمان مەنتیق وبیری داڕزیوی دوبارە کردبوەوە، بە دەنگ ووێنە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت بڵاوبوەوە، وکەوتە ژێر نەفرەت وڕەخنەی سونەکان وزۆر لە شیعەکانیش. بەڵام بەربەهاری ئەو مەنتیقە نەخۆش وفاشیەی تەنها بە نوسین بەجێ هێشتوە، وشوێن کەوتوانیشی دەقا ودەق پەیڕەوی لێدەکەن، ئەی نابینی چەند مەکروهن لەناو خەڵکی لەبەر ئەو تەسەوراتە نەخۆش وپارانۆییانە؟!

"ورأى يونس بن عبيد ابنه وقد خرج من عند صاحب هوى، فقال : يا بني من أين جئت ؟ قال : من عند فلان، قال : يا بني! لأن أراك خرجت من بيت خنثَى، أحب إلي من أن أراك تخرج من بيت فلان وفلان، ولأن تلقى الله يا بني زانيا فاسقا سارقا خائنا، أحب إلي من أن تلقاه بقول فلان وفلان ألا ترى أن يونس بن عبيد قد علم أن الخنثى لا يضِلّ ابنه عن دينه، وأن صاحب البدعة يضِلّه حتى يكفر ؟! ."[١٣]

## دابڕانی سەرتاسەری لەگەڵ ئەوانەی سەلەفی نین!!

ئینجا بۆ توندتر کردنی ئەو دابڕانەی سەلەفیەکان لەگەڵ هەموو موسڵمانانی تر کە زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانان پێک دەهێنێت، چەندین وتەی تری ئەئیمەکانی سەلەفییەت دەهێنێتەوە، کە تێکڕایان بیانوو دەدەنە دەست کەسانی تر تا سەر ئێسقان ڕقیان لێیان بێتەوە:
"وقال سفيان الثوري : من أصغى بإذنه إلى صاحب بدعة، خرج من عصمة الله، و وكِلَ إليها يعني : إلى البدع ."
(ئەوەی گوێی بۆ خاوەن بیدعەیەک گرت، لە پاراستنی خوا دەردەچێت، ودەدرێتە دەستی بیدعە)
وقال داود بن أبي هند : أوحى الله تبارك وتعالى إلى موسى ابن عمران: لا تجالس أهل البدع، فإن جالستهم فحاك في صدرك شيء مما يقولون أكببتك في نار جهنم.
فوزەیلی کوڕ عەیاز (الفضيل بن عياض) هەر نەفیری عام دەردەکات دژی هەر نا سەلەفیەک لە وتە بەنرخەکانی:
" " من جالس صاحب بدعة ،لم يعطَ الحكمة . وقال : لا تجلس مع صاحب بدعة، فإني أخاف أن تنزل عليك اللعنة، وقال : من أحب صاحب بدعة، أحبط الله عمله، وأخرج نور الإسلام من قلبه ."[١٤]
(ئەوەی لەگەڵ بیدعەچی دانیشت، ئەوە خوا حیکمەتی پێ نادات...لەگەڵ خاوەن بیدعە دامەنیشە چونکە دەترسم نەفرەتت بەسەردا بباریێت!! هەروەها دەڵێت: ئەوەی بیدعەچی خۆش بوێت، خوا کارەکانی پوچەڵ دەکاتەوە، وروناکی ئیسلامی لە دڵ دەردەکات)
نەبرەی دوژمنکارانەی بەرزتر دەکاتەوە بۆ ئاستێک تا دەگاتە شەڕی سەرتاسەری، بێ ئەوەی گوێ بدەن بە گرنگی یەک پارچەیی کۆمەڵگای ئیسلام:
(ئەوەی خاوەن بیدعەیەکی بەگەورە زانی، ئەوە لەوانەیە کە کۆمەک بەوانە دەکەن کە ئیسلام دەڕوخێنن، ئەوەی بەڕووی بیدعەچی پێکەنی، ئەوە گاڵتە بەوانە دەکات کە خوا بۆ موحەمەدی دابەزاندوە!!، ئەوەشی کچەکەی خۆی دایە بیدعەچی یەک ئەوە پەیوەندی رەحمی پچراند، ئەوەشی بەدوای جەنازەی بیدعەچی رۆیشت (هەتا پاش مردنیش لێی ناگەڕێن!!) دەکەوێتە بەر ناڕەزایی خوا هەتا دەگەڕێتەوە. هەروەها فوزەیلی کوڕی عەیاز دەڵێت: لەگەڵ جولەکە

ومەسیحی نان دەخۆم، لەگەڵ بیدعەچی نایخۆم، وحەز دەکەم شورایەکی ئاسنین لە نێوان من و بیدعەچی دا هەبێت. ئەگەر خوا زانی پیاوێک ڕقی لە بیدعەچی یە، ئەوە لێی خۆش دەبێت، هەرچەندە کردەوەی چاکیشی کەم بێت، خاوەن سونەش هەرگیز پشتگیری بیدعەچی ناکات تەنها بە نیفاق نەبێت!!!

"من عظّم صاحب بدعة ،فقد أعان على هدم الإسلام، ومن تبسم في وجه مبتدع، فقد استخف بما أنزل الله عز وجل على محمد صلى الله عليه وسلم، ومن ز وج كريمته من مبتدع، فقد قطع رحمها، ومن تبع جنازة مبتدع لم يزل في سخط الله حتى يرجع . وقال الفضيل بن عياض : آكل مع يهودي ونصراني ولا آكل مع مبتدع، وأحب أن يكون بيني وبين صاحب بدعة حصن من حديد .وقال الفضيل بن عياض : إذا علم الله من الرجل أنه مبغِض لصاحب بدعة، غفر له، وإن قلّ عمله، ولا يكن صاحب سنة يمالىء صاحب بدعة إلا نفاقا"[١٥]

شەڕەکە بەوە دەگات کە لە پێناو خوا، بیدعەچی یان (غەیرە سەلەفی) بەو پەڕی زبری وتوند وتیژەوە موعامەلە بکەیت، چونکە هەر بە پێی وتەکانی ئەو واعیزەی کەراهیەت: ئەوەی ڕووی لە بیدعەچی وەرگێڕا ئەوا خوا دڵی پڕ دەکات لە باوەڕ، وئەوەی بە خاوەن بیدعە هەڵشاخا یان تێی خوڕیەوە، ئەوە خوا لە ڕۆژی تۆقاندنی گەورە هێمن وئاسودەی دەکات، وئەوەشی ئیهانەی (!)بیدعەچی بکات خوا سەد پلە بەرزی دەکاتەوە لە بەهەشت!!!

"ومن أعرض بوجهه عن صاحب بدعة، ملأ الله قلبه إيمانا، ومن انتهر صاحب بدعة آمنه الله يوم الفزع الأكبر، ومن أهان صاحب بدعة، رفعه الله في الجنة مائة درجة"[١٦]

بێنە بەرچاوت، کۆمەڵگایەک بەو تیۆر وعەقاید وزیهنیەتە دوژمنکار و جیاخوازو توندڕەوەی سەلەفییەت حوکم بکرێت چ کارەساتێکیان بەسەر دێت؟! نمونەی بەرگە نەگرتنی خەڵک بۆ ئەو جۆرە تێگەیشتنە زۆرە لە کوردستان وئەفغانستان وجەزائیر وچەندین وڵاتی تر، بەڵام جەماوەر لای سەلەفییەت هیچ سەنگ وبارستاییەکی نییە، بۆیە ئامادەن لەسەر یەک دەریا لە خوێنیش بگەنە مەرامی حوکم کردنی کۆمەڵگا بە مشتێکی پۆڵایی، ئەوەش لە ئەنجامی هەڵە تێگەیشتن لە چەند دەقێکی قورئانی کە سەرکۆنەی چەمکی زۆربە دەکات، وەک:

قال عز وجل : (وَإِنْ تُطَعِ أَكْثَرَ مَنْ فِي الْأَرْضِ يُضِلُّوك عَنْ سَبِيلِ اللهِ إِنْ يَتَّبِعُونَ إِلّا الظَّنّ وَإِنْ هُمْ إِلّا يَخْرُصُونَ ) الأنعام : ١١٦

[خـۆ ئەگـەر فەرمانبـەردارو ملكەچـى زۆربـەى خەڵكـى سـەرزەوى بيـت ئـەوە لـە ڕێبـازى خـوا وێڵـت دەكـەن، چونكە شـوێنى هيـچ شـتێک ناكـەون جگـە لـە گومـان و تەنهـا گۆتـرەكارى دەكـەن].

وقال تعالى : (وَمَا أَكْثَرُ النَّاس وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ ) يوسف : ١٠٣

[دڵنيـاش بـە كـە زۆربـەى خەڵكـى بـاوەڕدار نيـن، هەرچەنـدە تـۆ زۆر بەپـەرۆش بيت و هـەوڵ بدەيت و تـێ بكۆشـيت]

وقال تعالى: ( أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَام بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا) الفرقـان:٤٤

[ ئايـا وادەزانيـت زۆربـەى ئەوانـە ڕاسـتيەكان دەبيسـتن، يـان بيـرو هۆشـيان دەخەنـە كار؟ ئەوانـە مـالآت نـە بێـت، هيچـى تـر نيـن، بەڵكـو گومڕاتريشـن لـە مـالآت].

وقال تعالى: (وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِمْ مِنْ عَهْدٍ وَإِنْ وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ) الأعراف:١٠٢

[ بەشـى زۆرى ئـەو خەڵكـە سـەرگەردانەمان دەسـت نەكـەوت كـە پەيمـان شـكێن نەبـن و بەڕاسـتى زۆربـەى ئەوانەمـان بەدەرچـوو لـە ئاينـى خـوا دەسـتكەوت]

وقال تعالى :( وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاس لَا يُؤْمِنُونَ ) الرعد : ١[بەلآم زۆربـەى خەڵكـى بـاوەڕ ناهێنن.]

كانونى يەكەم ٢٠٠٧ گۆڤارى ستاندارد

## ژێدەرەکان

[١]- ص ٣٤٢، طبقات الحنابلة للامام القاضي ابي الحسين محمد بن محمد بن الحسين بن ابي يعلي الحنبلي النسخة الموجودة على الموقع.http://saaid.net/ book/open.php?cat=book&v=١٢٢٩ وموقع مكتبة مشكاة الاسلامية.
[٢] طبقات الحنابلة، ٣٢٥
[٣] – طبقات الحنابلة، ٣٤٢-٣٤٣
[٤]- هەمان سەرچاوە ل ٣٤٣
[٥] – ٣٣٣هەمان سەرچاوە
[٦] – هەمان سەرچاوە:
[٧] هەمان سەرچاوە ٣٣٤
[٨] هەمان سەرچاوە ٣٣٤
[٩] هەمان سەرچاوە ٣٣٤
[١٠] هەمان سەرچاوە ٣٤٠ -٣٤١
[١١] – ٣٣٧
[١٢] ٣٣٨
[١٣] – ٣٣٨
[١٤] – ٣٤١
[١٥]- ٣٤٢
[١٦] – ٣٤٢

# ئیبن تیمیه و
# ناسیبیەت و سەلەفییەت وعروبەت

جیهادی قەبر!

ئیبنول تەیمیە (٦٦١-٧٢٨هـ) بایەخە بچوکەکانی ژیانی ڕۆژانەی ناوی (أحمد بن عبدالحلیم بن عبدالسلام بن عبدالله بن الخضر بن محمد النمیري الحراني) لە نێوان ساڵی ٦٦١-٧٢٨هـ ژیاوە، هەر لەمنداڵیەوە لە گەڵ خێزانەکەی چۆتە شام ولە دیمەشق ژیانی بردۆتە سەر. گومانی تێدا نییە کە ئیبنول تەیمیە زانایەکی گەورەی ئیسلامە وبەرهەمێکی یەکجار زۆری هەیە لە جۆرەها زانستی ئیسلامیدا، ئەوانەش هەندێکن لە کتێبەکانیەتی:

(إثبات الصفات والعلو والاستواء، منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة والقدرية، بيان تلبيس الجهمية في تأسيس بدعهم الكلامية، الرد على البكري في الاستغاثة، رأس الحسين، قاعدة في فضل معاوية، جواب في يزيد بن معاوية وهل يجوز سبه أم لا ؟ الرد على أهل كسروان الرافضة، درء تعارض العقل والنقل، العقيدة الواسطية، الفتوى الحموية الكبرى، الرد على المنطقيين، شرح حديث النزول، عرش الرحمن، قاعدة جليلة في التوسل والوسيلة، الأسماء والصفات، الفرقان بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان، رفع الملام عن الأئمة الأعلام، نقد مراتب الإجماع )

کە ژیانی سەلەفیەکانی هاوچەرخ دەبینیت، هەست دەکەیت خەم و بیریان لەناو ژیان و کیشەکانی سەردەم نییە، مردنی خەڵکانێک لە برسان هیچ نییە لە چاو زیارەتی بە کۆمەڵی ئەو خەڵکانە بۆ سەر مەزارێک و قەبرێک! هەر بۆیەش هێندەی بیر لەوە دەکەنەوە کتێبەکانی تەوحید و دژی بیدعە و دژایەتی قەبر زیارەتی بگەیەنن بە خەڵکی برسی، هێندە خەمی ئەوەیان نییە کارتۆنێک خواردنیان پێ بگەیەنن! کەچی بزوتنەوە تەبشیریە مەسیحیەکان، یەکەم شت بیری لێ بکەنەوە گەیاندنی

خواردن و خزمەتگوزاری تەندروستی و پەروەردە وفێرکردنە! ئەو خەم و خەونە بچوکانەی سەلەفیەکان، ڕەنگدانەوەی خەم و خەونە بچوکەکانی ئیمامەکانیانە، بۆیەش دەسەڵاتداران زۆر بە ئاسانی هاوپەیمانیەتیان لەگەڵ سەلەفیەکان دەکەن، چونکە کەمێک ئازادی ڕیش و نیقاب و نوێژێکی بەر کامێرا، و چەند کارێکی ڕوکەشیتر، بەسە بۆ ڕازیکردنیان و کردنیان بە وەلی ئەمر. ببینەماڵباتی ئال سعود چۆن هەموو فەسادێکی مادی ومەعنەوی دەکەن، تەنها لەبەر ڕاگرتنی چەند دیاردەیەکی روکەش و پشتگیری کردنی تێڕوانینی سەلەفیەت، چۆن بۆتە ئەو وەلی ئەمرە موقەدەسەی زۆربەی سەلەفیەکان؟!

لە کتێبێکی نەناسراو کە ژیننامەیەتی بە پێنووسی خادیم و قوتابیەکی خۆی نووسراوە، دەردەکەوێت کە ابن تیمیە خوی دوو بەرەکێیی وهێرش کردنە سەر مەزهەبەکانی تر وزانایانی، وداب ونەریتی ڕکابەری وتاکڕەوی وحەزی جەدەلی، هێندەی تر لە ناو فیکری سەلەفی وسەلەفیەکان زیاتر کرد. ابن تیمیە لەو ژیننامەیە کە بە پێنووسی خادیمی خۆی (إبراهيم بن أحمد الفياني) [١٧] نوسراوە، دەردەکەوێت کە ئەو بە پلە یەک نەریتی دژایەتی کردنی قەبر ومەزارەکانی لە ناو سەلەفیەکان دامەزراندوە، بەو شێوە تراژیکۆمیدیەی کە هەیە، تا ئەو ڕادەیەی کە لەناویان دەبیت وادەزانیت ئەو قەبرومەزارانە بەرپرسیارن لە هەموو کارەساتەکانی ئومەتی ئیسلام. هەر ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەش بوو، هانی چەند توندڕۆیەکی سەلەفی دا کە ئێسک وپرۆسکی شێخانی هەورامان، پاش سەدان ساڵ لە کۆچ کردنیان دەرکەن، بەبێ هیچ حورمەت دانانێک بۆ گۆڕ وکەسانێکی کۆچ کردوو! چونکە بە پێی ئەو یاداشت نامەیە بە دەستی خۆی چەندین شوێن لەو شوێنانەی لە ناو بردوە، نوسەری ئەو یاداشتانە لە زۆربەی بەشەکان بە ڕوداوی لە ناوبردنی شوێنێک دەست پێدەکات، بۆ نموونە لە یەکەم بەشی ئەو کتێبەدا دەنووسێت:

"فبلغ الشيخ أن جميع ما ذكر من البدع يتعمدها الناس عند العمود المخلق الذي داخل الباب الصغير ...قام واستخار الله في الخروج إلى كسره، فحدثني أخوه الشيخ الإمام القدوة شرف الدين عبد الله بن تيمية قال : فخرجنا لكسره ...قال : فتقدمنا إليه، وصحنا على الحجّارين : دونكم هذا الصنم، فما جسر أحد منهم يتقدم إليه . قال : فأخذت أنا والشيخ المعاول منهم، وضربنا فيه، وقلنا : { جاء الحق وزهق الباطل إن الباطل كان زهوقا }.[١٨]

(شێخ پێی گەیشت کە خەڵکی بیدعەکاری دەکەن لە لای ستونێکی بۆن خۆشکراو لە ناو دەرگا بچوکەکە، ئەویش ڕابوو وئیستخارەی خوای کرد بۆ شکاندنی، براکەی ئیبن تەیمیە، شێخ و ئیمام شرف الدین عبدالله بۆی گێڕامەوە: خۆی وبراکەی بۆی دەرچوون، وهەندێک بەردکێشەکان لەوێ بوون هاواریان کردنێ ئەو سەنەمە بشکێنن، کەس نەوێرا بچیتە پێشەوە، من وشێخ (ابن تیمیە) پاچ و قازمەکانمان لێوەرگرتن، ودەستمان بە شکاندنیان کرد وبە خوێندنی- ئەو ئایەتە: جاء الحق وزهق الباطل إن الباطل كان زهوقا)
هەر ئەوەشە ئەمڕۆ توندرەوانی جیهانی ئیسلامی و لیبیا ئەوانەی لە سایەی هێزەکانی ناتۆوە سەرکەوتن، ئەمڕۆ بە شۆفەڵ وبلدۆزەر بەناو مەزارگا وقەبر وشوێنی تری پیرۆزی خەڵک کەوتوون، بەبێ ڕەچاوکردنی هیچ حورمەتێک نە بۆ زیندوەکان ونە بۆ مردوەکان!!

لە بەشی دووەمدا دەڵێت:
«شێخ – ابن تیمیە- ناوبانگی مزگەوتێکی پێگەیشت بەناوی مزگەوتی الكف [لەپ]، گوایە لە کۆن زەمانەوە یەکێک پێغەمبەری لە خەو دیوە باسی چەند ڕوداوێکی بۆ کردوە، ئەویش گوتویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەگەر باسی ئەو شتانەی تۆ بۆت باس کردم، بۆ خەڵک بکەم باوەڕم پێ ناکەن! ئەویش گوتی: ئەوە لەپی ڕاستم لەسەر ئەو حەوشە بۆ بەڵگەی ڕاستگۆیت، لە پی خستە سەری ورۆچوو، وشوێنەواری لەپێک بە پێنج ئەنگوستی لێ دروست کرد، خەڵکیش کەوتنە تەقدیس کردنی بە نەزر بۆ کردن وداوای باران بارین، ئەوەش بە شێخ گەیشتەوە، وئەویش خۆیی وجەماعەتەکەی وبراکەی شێخ شەرەفەدین بۆ دەرچوون.. شوێنەکەیان تێکشکاند، نە شوێنەواری ما ونە باسوخوازی، سوپاس بۆ خوا“

بەشی سێیەمیش هەروەها بە لەناوبردنی شوێنێک دەست پێدەکات:
وكانت صخرة كبيرة عظيمة في وسط محراب مسجد النارنج فيتوجه المصلي إليها ضرورة ... وقد استفاض بين الناس أنه حط عليها رأس الحسين عليه السلام فانشقت له، وأنها متى انشقت كلها قامت القيامة، ولها في كل سنة ـ يوم عاشوراء ـ عيد يجتمع فيه ... فبلغ ذلک الشيخ، فطلب الحجارين من القلعة،

وخرج إليها ومعه شرف الدين في جماعة كبيرة ...فتقدم هو وأخوه شرف الدين وضربها بنعله ... فكسروه، وحملوه على أربع عشرة بهيمة وأحرقوه كلسا .[١٩]
(گاشە بەردێکی گەورە لە نێوەڕاستی میحرابی مزگەوتی نارینج دا بوو، نوێژ خوێنان بە ناچاری بەرەو بەردەکە دەوەستان، لە ناو خەڵک وا باو بوو کە سەری حەزرەتی حوسێنی لەسەر دانراوە ولەت بوە بۆی، وکەی بە تەواوی بەردەکە لەت بوو قیامەت هەڵدەستێت، وهەموو ساڵێک لە عاشورا لای کۆدەبنەوە... کە ئەو هەواڵە بە شێخ گەیشت داوای بەردچیەکانی کرد وخۆیی وشەرەفەدین بە یاوەری کۆمەڵێکی زۆر لەگەڵی دەرچوون، خۆیی وشەرەفەدینی برای پێشکەوتن وبەربوونە لێدانی بەردەکە بە نەعلەکانیان (!) دوایی وردوخاشیان کرد ولەسەر چواردە ولاخ هەڵیان گرت وسوتاندیان تاکردیان بە کلس – گەچ )
ابن تیمیە زۆربەی ژیانی لە شام بردۆتە سەر، بۆیە وەک شامییەکان بیری کردۆتەوە وجۆریک لە مەیلی (ناسیبیەتی) (الناصبیە) تێدا بوە، کە لە سادەترین مانای دا، بە دژایەتی کردنی حەزرەتی عەلی دێت، بۆیە لە نوسینەکانی جۆرێک لە سوکایەتی کردن، وتۆمەتبار کردنی حەزرەتی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیبی تێدایە.
من خۆم لە سەرەتادا کە گوێم لەو قسانە بوو باوەڕم نەدەکرد، بەڵام کە لە چەندین کتێبدا دەمدیت چۆن زانایانی گەورەی ئیسلام ئەو ڕەخنەیە ئاڕاستەی ابن تیمیە دەکەن وەک ئیمام (ابن الحجر العسقلانی) کە دەربارەی (منهاج السنة) ووەڵامەکەی ابن تیمیە لەسەر (ابن المطهر الحلي) ئیبنول موتەهەر لە کتێبی (لسان المیزان) دا دەڵێت:
«لكنه ردّ في ردِّه كثيراً من الأحاديث الجياد التي لم يستحضر حالة التصنيف مظانها لأنه كان لإتساعه في الحفظ يتكل على ما في صدره والإنسان عامد للنسيان، وكم من مبالغة لتوهين كلام الرافضي أدته أحياناً إلى تنقيص عليّ رضي الله عنه“[٢٠]
”بەڵام لە وەڵامەکەیدا زۆر حەدیسی چاکی ڕەت کردۆتەوە، چونکە نەدەگەڕایەوە بۆ سەرچاوەکان بەڵکو پشتی بە لەبەرکردن وحیفزکردنی خۆی دەبەست، مرۆڤیش قابیلی لە بیرکردنە، وچەندین سەرەڕۆیی وموبالەغە کردنی لە وەڵامدانەوەی قسەکانی رافیزیەکە (واتە ئیبنول موتەهەری حیلی)، گەیاندویەتی بەوەی جاروبار لە پایەی عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب کەم کاتەوە“
هەروەها لە کتێبی (الدرر الكامنة) ابن الحجر العسقلانی دەڵێت:
(ومنهم من ينسبه إلى النفاق[٢١] لقوله في علي ما تقدم ولقوله أنه كان مخذولاً حيث

ما توجه وأنه حاول الخلافة مراراً فلم ينلها وإنما قاتل للرياسة لا للديانة ولقوله أنه كان يحب الرياسة...) [٢٢]

"واته هەندێک لە زانایان تۆمەتی نیفاقیان دەخستە پاڵی –ابن تیمیە – لەبەر ئەو قسانەی کە دەرهەق بە عەلی وتویەتی، وەک: ئەو (واتە حەزرەتی عەلی) هەردەم پشت لێکراو بوو بە هەر لایەکدا چووبا، وچەندین جار هەوڵی بە دەستهێنانی خەلافەتی دا بەڵام گیری نەکەوت، وعەلی بۆ سەرۆکایەتی دەجەنگا نەک بۆ دین، وئەو حەزی لە سەرۆکایەتی کردن بوو..."

تشرینی یەکەم ٢٠٠٨ گۆڤاری ستاندارد

ژێدەرەکان

[١٧]- نبذة عن آخر حياة شيخ الاسلام ابن تيمية، بقلم خادمه إبراهيم بن أحمد الفياني، حققه وعلق حواشيه محب الدين الخطيب، طبعة انصار المهدي.

[١٨] هةمان سةرضاوةى ثيَشوو، لاثةرة ٨-٩

[١٩] هةمان سةرضاوةى ثيَشوو، لاثةرة ١١

[٢٠] – لسان الميزان، ابن حجر العسقلاني، ج٦ ص ٣١٩

[٢١] – مةبةستى لةو فةرمودةيةى ثيَغةمبةرة كة دةلَيَت: { لا يبغضك إلا منافق }.

[٢٢]- الدرر الكامنة في أعيان المئة الثامنة : ابن حجر العسقلاني ، ط دار الجيل، بيروت، ١٤١٤ هـ .،ج١ ص ١٥٣ وما بعدها.

# ناسیبیەت لە ڕونترین شێوەدا!

## ئیبن تەیمیە وەك نمونە

بە نسبەت ابن التیمیة ش، بێگومان زانایەكی گەورەیە وعەقڵیەتێكی مەوسوعی گەورەیە، بەڵام ئەوە بەو مانایە نییە كە غەڵەت ناكات، ووەک ئیمامەكانی شیعە مەعسومی بكەین. ڕەخنەم لە ئیبن تەیمیە هەیە كە لە دەیان شوێن لە نووسینەكانیدا دەست خۆشی لەسەر بڕینی جەعدی كوڕی درهەم دەكات، لەسەر دەستی والیەكی دڕندەی تاوانباری ئومەویی خالیدی كوڕی عەبدوڵڵای قەسری، كە ئیبن تەیمیە لەسەر لیستی سەلەفی ساڵحی حسێب دەكات، كە بە دڕەندەترین شێوە لە ڕۆژی جەژن ولەژێر مینبەری مزگەوتدا سەری بڕی، بەو پەڕی سوكایەتی كردن بە ئادەمیەتی، كاتێ بە ئاژەڵی چوواند، و گووتی: ڕەحمەتی خواتان لێ بێت سەری قوربانیەكانتان ببڕن، و منیش سەری قوربانی خۆم جەعدی كوڕی درهەم دەبڕم!!

هەموو زانا ونەزانە سەلەفیەكان بەو پەڕی شانازییەوە باسی ئەو سەربڕینەی جەعد دەكەن، كە مامۆستای خەلیفە مەروانی كوڕی محەمەد بوو، و محەمەدی كوڕی عەبدەلوەهابیش، ئیمامی سەلەفیەكانی ئەو سەردەمە، وەسفی دەكات بە: « انه كان من أشهر الناس بالعلم والعبادة»! بەبێ هیچ حورمەت دانانێک بۆ خوێنی موسڵمان لەناو مزگەوتیش ولەڕۆژی جەژنیش!! هەر ئیبن تەیمیە لە منهاج السنه زیاتر لە سێزدە جار باسی ئەو پاڵەوانیەتە دەكات، كەچی بكوژەكە خۆی، خالید القسری هێندە دڕندە وخوانەناس بوو نەدەگەیشتە كەوشەكانی زانایەكی وەک جەعدی كوڕی درهەم!

كەسانێک لەسەر فیكری ئیبن تەیمیە پەروەردە بوون وپێی سەرسامن، سەیر نییە كە هێزیان لەدەست بوو لە هەر شوێنێک، بە هەمان شێوە نەیارەكانی فیكری خۆیان لەناو موسڵمانانیش بەو شێوەیە سەربڕن بەبێ خەم وبێ تەرەدود. سەدان وهەزارانیان سەربڕیوە بە جۆرێک، مرۆڤ قێزی لە ئادەمیەتی خۆی دەبێتەوە. ئەو هەموو سەربڕینەی عێراق وئەفغانستان وجەزائیر وسۆمال وكێ وكێ، لە ئەنجامی كەوتنە ژێر كاریگەری ئەو پیاهەڵدانەی ئیبن وتەیمیە وزانایانی تریانە بە خوێن ڕشتنی نەیارەكانیان، وئەو هەموو سەربڕینە لە بۆشاییدا نەهاتوە!

# ئیبن تەیمیە پێشێلی بنەماکانی سەلەفیەت دەکات!

ڕەخنەم لە ئیبن تەیمیە لەسەر بنچینەی ئەوەیە کە خۆی یەکێکە لە تیۆریست ومونەزیرەکانی عەقیدەی سەلەفی، کەچی خۆی بە ڕونترین شێوە پێشێلی بنەماکانی سەلەفییەت دەکات، بۆ نمونە: کە سەحابە خەتی سورە لە لایان، نابێت کەس ڕەخنەیان لێ بگرێت، هەر خۆی لەسەر حەزرەتی عەلی قسەی وا دەکات کە وەک دەڵێن [مالیک دەربارەی ئەرەق نەیگوتوە] ئەو سەلەفیانەی کە گوێیان لێ نیە دەریایەک خوێن بڕێژن بۆ ئەوەی قسەیەک بە معاویە یان یەزیدی قاتیل وفاسیق نەگوترێ، کەچی ئەو ئیمامەیان، ابن تیمیەی شێخی ئیسلام وناسیری سونە وخاوەن چەند لەقەبی تر، دەیان قسەی خراپ دەرهەق بە حەزرەتی عەلی و سەحابەی دەڵێت، بێ ئەوەی بوێرن بڵێن ئەو کارە هەڵەیە وچەندین تۆمەتی دەخاتە پاڵ.

ڕەخنەیەکی ترم لە ئیبن تەیمیە لەسەر بنچینەی ئەوەیە، کە خۆی یەکێکە لە شارەزا هەرە گەورەکانی فەرمودە ناسی، کەچی هەموو ئەو فەرمودە هەڵبەستراوانەی کە باسی گەورەیی عەرەب وعروبە دەکەن بە پێچەوانەی قورئان، کە فەقێیەکی موسڵمانیش دەزانێ ئەو فەرمودانەی هەڵبەستراو ومەوزوعن، ئەو بەوپەڕی حەماسەتەوە ڕاستیان دەکاتەوە وبە ڕاست ودروست لە قەڵەمیان دەدات لەژێر کاریگەری نەزعە ئومەویەکەیدا.

پاش گەڕانەوە بۆ کتێبی منهاج السنە، ڕاستی ئەو قسانەم هەمووی بۆم بەدیار کەوت، کە ئەو سونەیەی ابن تیمیە بانگەشەی بۆ دەکات سونەی ئومەوییە، کە یەکێک لە خەسڵەتە سەرەکیەکانی ئەو ڕێبازە، تانە دانە لە حەزرەتی عەلی وتەقدیس کردنی هەموو سەحابە تولەقائەکانە وەک: مروان و وەلید وابو سفیان ومعاویە ویزید وهتد. سەیر لەوەدایە هەر یەکێک بچوکترین ڕەخنە نالێم لە عثمان بن عفان بگرێت، بەڵکو لە یەکێک لەو (طلقاء) تولەقایانە [١] بگرێت، ئەوە هەموو دونیای لێ دەنگ دەدەن، گوایە قسەی بە سەحابی گوتوە! بەڵکو کار بە تەکفیر کردنی دەگات.

بەڵام عەلی کوڕی ئەبو تالیب، لەلایەن بچوکترین سەلەفییەوە تا گەورەترین زانایان، لە ئەمسالی ابن تیمیە قسەی پێ دەوترێت، کەچی مێشێکیان لێ میوان نییە.! ئەی عەلی کوڕی ئەبو تالیب یش یەکێک نییە لە سەحابە هەرە گەورەکان؟! چۆن ڕیزی معاویە لە عەلی زیاتر دەگیرێت، ئەگەر خەلەلێک لەو بڕوایەدا نەبێت؟!

کەوابوو بۆ دەبێت تانە لێدانی ئەو بۆ ابن تیمیە ڕەوا بێت، بەڵام ئەگەر یەکێکی وەک سەید قوتب (سید قطب) چەند ڕەخنەیەکی لە سیاسەتی دراوی وخزم خزمێنەی حەزرەتی عوسمان گرت، ئەوە سەلەفیەکان تەکفیر وتەفسیق وتەبدیعی کەن؟! یان ئەگەر ئیمامێکی گەورەی وەک (الطبري) موفەسیر ومێژوو نوس بەس لەبەر ئەوەی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی پێ فەقیە نەبێت، وپێی وا بێت تەنها موحەدیس بێت وەک لە کتێبێکی بە ناوی (اختلاف الفقهاء) وای بۆ چوو بوو، کە کوڕی حەنبەل نە سەحابیە ونە تابیعی، هێندە موحارەبە کرا تا ڕادەی تاوانبار کردن بە کوفر وئیلحاد.

سەیر لەوەدایە ابن تیمیە لە زۆربەی ڕەخنەکانی بۆ حەزرەتی عەلی، ناڵێت من وادەڵێم بەڵکو دەڵێت: ئەگەر ابن موتەهەر وادەڵێ لە دژی فلان وفلان، ناسیبیەکیش (الناصبیة) لەوانەیە وا بڵێت!! کەچی هەر خۆی هەمان قەولی ناسیبیەکە تەبەنا دەکات، وەک بڵێی دان بە ناسیبیەتی خۆیەوە بنێت!!

## ناسیبیەت لە ڕونترین شێوەدا!

-٢-

ئێمەش کە حەزرەتی عەلیمان هێنایەوە بە نموونە، لە باسەکەی ئیبن تەیمیە، وکە بەرگریش لە حەزرەتی عەلی دەکەین لە گۆشەی شیعەکانەوە ناڕوانینە کێشەکان، کە حەزرەتی عەلی بەقەد نیمچە خوایەک تەقدیس دەکەن، بەڵام ناکرێت لە فەزڵ وپایەی دینی ومرۆیی یەکێکی وەک عەلی کەمبکرێتەوە، لەسەر حیسابی ڕوو سپیکردنەوەی کەسانێکی وەک معاویە ویەزید وخەلیفەکانی بەنی ئومەیە و عەباس، کە گوناهە بە بیریشت تێپەڕێت بەراوردیان بە عەلی پێ بکەیت! هەرچەندە زۆر لە قسەکانی ئیبن تەیمی،ە وهەڵسەنگاندنەکانی ڕاستن، وحەزرەتی عەلی لە سەرووی ڕەخنە نییە، بەڵام من پێم وایە نەزعە ئومەویەکەیە ئیبن تەیمیە دەجوڵێنێ، وئینجا بەپێی پێوەرەکانی تیۆری عەدالەتی سەحابە، سەحابە هێڵی سورن، عەلی یش یەکێکە لە هەرە سەحابە گەورەکان! ئینجا خودی ئیمامی تەبەری [ئیمامی موفەسیران] یش کاتی خۆی کە حەنبەلیەکان بەدلیان نەبوو بە شیعایەتی تاوانباریان کرد، وەک لە موعجەمی یاقوتی حەمەوی دا هاتوە»: دفن

لیلا خوفـاً من العامـة لأنـه كان یتهم بالتشیع»!! لەترسـی خەڵکی بـازاڕی کە لەژێر کۆنترۆڵی حەنبەلیـەکان بـوون بەشـەو نێژرا چونکە تاوانبـار دەکرا بـە شـیعایەتی!!!
من کە باسـی ڕەخنەکانی ابن تیمیە دەرهـەق بـە حەزرەتـی عەلی دەکـەم، مەبەسـتم ئەوە نیـە نیشـانی دەم کـە ئـەو کوفری کردوە، نەخێر هەمـوو کەسـێک قابیلی ڕەخنـە لێگرتنـە بـە هـەق، بـەڵام ابـن تیمیـە بـەو کار ومەسـلەکەی، کۆڵەگەیەکـی گـەورەی سـەلەفییەت هەڵدەوەشـێنێتەوە ئەویـش تیـۆری عەدالەتـی سـەحابەکان وزمـان پاراسـتن لێیـان و خیـر القـرون وهتـد!
ماقوڵ نیە تۆ دوو کتێب بنوسـیت بۆ دیفاع کـردن نـەک هەرلـە معاویـەش نـا (قاعـدة فـي فضـل معاویـة) بەڵکـو لـە یەزیدیـش (جـواب فـي یزیـد بـن معاویـة وهـل یجـوز سبە أم لا؟) ! کەچی بێیتو ئەو ڕەخنە توندانـە ئاڕاسـتەی لوتکەیەکی ئیسـلامی وەک حەزرەتی عەلی بکەیت!
نـەک هـەر عەلـی، بەڵکـو ڕەخنـە لـە عبـد اللـە ی کـوڕی عومەریـش دەگرێـت لـە کتێبی «اقتضـاء الصـراط المسـتقیم»، سـەبارەت بـە خویـەک کـە لـە زۆربـەی کتێبـە سـەلەفیەکان ستایشـی لـێ دەکرێـت، ئەویـش شـوێن کەوتنی سـەیر وسـەمەرانەیەتی بـۆ کار وکردەوەکانـی پێغەمبـەر، و بـە تایبەتـی گەڕانـی عەبدوڵلایـە بـەدوای ئـەو شـوێنانەی کـە پێغەمبـەر نوێـژی تیـادا کردبـوو، بـۆ ئـەوەی نوێژیـان لـێ بـکات. ابـن تیمیـە سـەرەڕای تاوانبارکردنـی ابـن عمـر بـە بیدعەچیەتـی (وتحـري هـذا لیـس مـن سـنة الخلفـاء الراشـدین، بل هـو ممـا ابتـدع) تاوانباریشـی دەکات بە گرتنی ڕێگایـەک بـۆ شـیرک کـردن دەربـارەی ئـەو خـوە دەڵێـت :»وذلـک ذریعـة إلـی الشـرک» ئـەوەش هۆیەکـە بـۆ شـیرک.!!
ئەگـەر سـەحابەکان بـە تایبەتـی سـەحابەیەکی زانـای وەک عبداللـە کـوڕی عومـەر، چاکتریـن وزاناترینـی ئومەتـی ئیسـلام بـن بـە پێـی تیـۆری سـەلەفییەت، ئـەی چـۆن عبداللـە کـوڕی عومـەر کارێـک دەکات بەرەو شـیرکی ببـات؟! هەموو لایەکیش دەزانێت کـە عبداللـە کـوڕی عومـەر لـە هـەرە موتەشـەدیدەکان بـوو لـە دیـن وعەقیدەدا![٢]!
ابـن تیمیـە بـەو جـۆرە باسـی عەلـی کـوڕی ئەبـو تاڵیبـی سـەحابی وبـەدری وزاوای پێغەمبـەر دەکات، کـە لـە بـارەی فـەزڵ وپایـەی ئـەو دەیـان فەرمـودە لـە (کتێبـە ڕاسـتەکانی حەدیـس) الصحـاح دا هەتـوە بـە بوخـاری وموسلیمیشـەوە:
گرنگترین ئەو تاوانانەی کە ابن تیمیە خستتویەتە پاڵ عەلی کوڕی تاڵیب ئەمانەن:
١.تاوانبـار کردنـی حەزرەتـی عەلـی بـە ڕشـتنی خوێنـی ژمارەیەکـی زۆری موسـڵمانان

بێ ئەوەی هیچ بەرژەوەندیەکی دین ودونیایان تێدا بێت.
لەو بارەیەوە دەڵێت: : «: ...فإن عليا قاتل على الولاية! وقتل بسبب ذلك خلق كثير عظيم! ولم يحصل في ولايته لا قتال للكفار ولا فتح لبلادهم ولا كان المسلمون في زيادة خير. وقد ولى من اقاربه من ولاه، فولاية الأقارب مشتركة –يعني بينه وبين عثمان– ونواب عثمان كانوا أطوع من نواب علي وأبعد عن الشر، وأما الأموال التي تأول عثمان، فكما تأول علي في الدماء وأمر الدماء أخطر وأعظم"[٣]
"عەلی لەسەر ویلایەت جەنگا، وخەڵکێکی زۆریش بەو هۆیەوە کوژران. لەسەردەمی ویلایەتی ئەودا نەشەڕ لە دژی کافراندا کرا، ونە وڵاتەکانیان فەتح کران، نە موسڵمانان خێری زیاتریان پێگەیشت. وخزمێکی زۆری خۆی دامەزراند، کەوابو دامەزراندنی خزمان شتێکی هاوبەشە (مەبەستی لە نێوان عەلی وعوسماندا) وپیاوەکانی عوسمان گوێڕایەڵتریش بوون لە پیاوانی عەلی، ودورتریش بوون لە خراپە وشەڕدا، بە گوێرەی پارە وپولیش، عوسمان تەئویلی تێدا کردبوو، وەک چۆن عەلی تەئویلی لە خوێن ڕشتندا کردبوو، کێشەی خوێنیش ترسناکتر وگەورەتریشە لە پارە وماڵ"

ابن تیمیە هەر لەو دەقەدا زیاتر لە حەوت تاوانی ڕیز کردوە دەرهەق بە حەزرەتی عەلی:

- شەڕ کردن لەسەر دەسەڵات.
- بە کوشت دانی موسڵمانان بە خۆڕایی بێ هیچ بەرژەوەندیەکی دینی یا دونیایان
- شەڕی ئەو تەنها دژی موسڵمانان بوو.
- موسڵمانان لەسەردەمی ئەو هەر لەپاشیان دەدا.
- خزم خزمێنەی دەکرد وەک عوسمان.
- پیاوانی عەلی زۆر خراپتر بوون لە پیاوانی عوسمان
- هەڵەی ئەو لە خوێن ڕشتن بوو، هەڵەی عوسمان لە پارە ودراو بوو.

من لێرەدا نامەوێ وەڵامی ئەو تۆمەتانە بدەمەوە، بەڵام بە پێی تیۆری سەلەفییەت نا بێت ئەو جۆرە قسانە ئاڕاستەی سەحابەیەکی گەورەی وەک عەلی بکرێت، ئینجا هەموو دەقە پیرۆزەکانی سەلەفییەت، وەک فەرموودەکانی

پێغەمبەر پشتگیری لە هەڵوێستی عەلی دەکەن، وەک فەرمودەی عەمار کە هێندێ پێیان وایە فەرمودەیەکی موتەواتیرە : (تقتل عماراً الفئة الباغية) ئینجا بەڕاستی ئەوەی حەزرەتی عەلی بناسی، وتەقدیری بکات دەزانێت تۆمەتی جەنگان لە پێناو دەسەڵات، زیاتر لایقی معاویەیە تا عەلی، ئەو معاویەیەی کە ابن تیمیە کتێبێکی تەواوی بۆ دیفاع لێکردنی نوسیوە.

بە نیسبەت شەڕی موسڵمانانیش، ئەوە حەزرەتی ئەبوبەکریش شەڕی موسڵمانانی کردوە لە جەنگەکانی هەڵگەڕانەوەدا (حروب الردة) ئینجا ئەگەر جیهادی کافران هەبێت لە شەریعەت دا، ئەوە قیتالی بوغاتیش [ستەمکاران]یش هەیە. ابن تیمیە فەقیە وزانا ونیمچە فەیلەسوف ئاگاداری ئەو ڕاستیانەیە بەڵام بە هەڵپەیە بۆ تانە لێدان لە عەلی.

دووەم هەر لە منهاجدا بەو شێوەیە بەرگری لە حەزرەتی عوسمان دەکات، وناڕاستەوخۆ پەلار وتوانج دەگرێتە حەزرەتی عەلی: «..فإن عثمان لم يقتل مسلماً ولا قاتل أحداً ولم يطلب قتال أحد على ولا يته أصلاً، فإن وجب أن يقال : من قتل خلقاً من المسلمين (على ولايته) إنه معصوم الدم ،وأنه مجتهد فيما فعله فلأن يقال عثمان معصوم الدم ...أولى وأحرى" [٤]

(کەچی عوسمان هیچ موسڵمانێکی نەکوشت ولەگەڵ کەسیش نەجەنگا (واتە لەسەر دەسەڵات گرتنە دەست) ولە بنەڕەتدا داوای لەکەسیش نەکرد لەسەر ویلایەتی بجەنگێت، ئەگەر پێویست کرا بوترێت: دەربارەی یەکێک خەڵکانێکی موسڵمانی کوشتبێت (واتە لەسەر ویلایەتی) کە خوێنی مەعسوم وپارێزراوە، وموجتەهیدە لەو کارانەی کە کردویەتی، ئەو وتنی مەعسومیەتی خوێنی عوسمان پەسندترە) هەر بە هەمان شێوە بەردەوام دەبێت لە توانج گرتن لە حەزرەتی عەلی دا لە پەنای بەرگری کردنی لە حەزرەتی ئەبوبەکردا: « ...وإن جاز أن يظن بأبي بكر رضي الله عنه أنه كان قاصداً للرئاسة بالباطل، مع أنه لم يعرف منه إلا ضد ذلك، فالظن بمن قاتل على الولاية ولم يحصل له مقصوده أولى واحرى"

(ئەگەر جایز بێت زەنی خراپ بە ئەبوبەکر (ڕەزای خوای لەسەر بێت) ببرێت، کەوا مەبەستی سەرۆکایەتی کردن بوبێت بە نا هەق، هەرچەندە دژی ئەو خوەی لێ زانراوە، لەو بوارە زەنبردن بەوەی لەسەر سەرۆکایەتی ویلایەت جەنگا – مەبەستی عەلی یە- ونەگەیشتە مورادیشی پەسندتر وئەولاترە)

٣

هـەر لـە هەمـان لاپـەڕەدا دەڵێت: «..إذا جـاء القـادح فقـال فـي أبـي بكـر وعمـر إنهمـا كانـا ظالمين متعدين طالبين للرئاسـة مانعين للحقوق، كان مـن المعلـوم أن هـذا الظـن لـو كان حقـاً فهـو أحـق بمن قاتـل عليها حتـى غلب! وسـفكت الدماء بسـبب المنازعـة التي بينـه وبين منازعـه ولـم يحصـل بالقتـال لا مصلحـة الديـن ولا الدنيـا ولا قوتـل فـي خلافتـه كافر ولا فرح مسـلم"[٥]

(ئەگـەر زەمكەرێـک هاتـوو دەربـارەی ئەبوبەکـر وعومـەر گوتـی ئـەوان سـتەمکار وتەعەداکـەر وداواکـەری سـەرۆکایەتی بـوون، ومـاف زەوتکـەر بـوون. شـتێکی زانـراوە، ئەگـەر ئـەو زەنـە ڕاسـت بێـت، ئـەوە ڕاسـتترە بـەو کەسـە بگوترێـت کـە لەسـەری (واتـە لەسـەر سـەرۆکایەتی) جەنـگا تـا دۆڕانـدی (واتـە حەزرەتـی عەلـی) وخوێنێکی زۆری ڕشت لەسـەر کێشـەی نێوان خۆیی وئەوانـی تـر، و شـەرەکانیشـی هیـچ خێرێـک وبەرژەوەنـدی بـۆ دیـن ودونیـا تێدا نەبـوو، ولـە خیلافەتـی ئـەودا تاقـە کافرێـک نەکـوژرا وتاقـە موسـڵمانێکیش دڵشـاد نەبـوو)

ئەگـەر ئـەو وتانـە، بەڵگـەی ناسـیبیەتی ابـن تیمیـە نەبـن، ئـەوە کـەس ناسـیبی نییـە، چـۆن کەسـێک خـۆی بـە ئیمامـی ئەهلـی سـونە بزانێـت، بـەو دەرونـە دەهریـە وپـڕ لـە قینـە، باسـی هاوەڵێکی گـەورەی وەک حەزرەتـی عەلـی بـەو جـۆرە دەکات؟! خـۆ سـەید قوتبی بەدبەخـت، یـەک لـە سـەدای ئـەوەی نـە گوتبـوو دەرهـەق بـە عوسـمان کەچـی تـا ئەمـڕۆش دۆڵـی بـۆ لێدەدەن، هەرچەنـدە سـەرچاوەکانی ئیسـلام دەڵێـن دەیەهـا سـەحابیش ڕەخنەیـان لـە هەندێـک لـە کردەوەکانـی عوسـمان دەگـرت! دەکرێ ئـەو سـەحابانەش تەکفیـر بکەیـن لەبـەر ئـەو ڕەخنانـە؟! وەڵامەکـەی لای تیـۆری سـەلەفییەتی هەڵاوێـردکار وئینتیاقئییـە، کـە هەیکەلـی سـەرەکی تیۆرەکـە لـە کـورەی ئومەوییـەکان دروسـت کـراوە!

ئینجـا ابـن تیمیـە لـە پـاش شـێوازی توانـج گرتـن، شـێوازێکی تـر بـەکار دەهێنێـت بـۆ هێرشـکردنە سـەر حەزرەتـی عەلـی، ئەویـش ڕۆڵـی کەسـێکی ناسـیبی وەردەگرێـت لـە هەڵرشـتنی ڕەخنەکانـی لـە دژی حەزرەتـی عەلـی، سـەیر لەوەدایـە، هەمـان ئـەو قسـە وتوانجانـەی ئـەو ناسـیبییەی گوتـوە، وەک بەرلـەوە بەرچاوتـان کـەوت. وەک بڵێی خـۆی دان بـە ناسیبیەتی خـۆی بێنێت، بەرگریەکـەش ئـەو جـارە بـۆ حەزرەتـی ئەبوبەکـر وعومـەر وهەتـا عوسـمانیش نیـە، بەڵکـو بـۆ موعاویـەی کـوڕی ئەبـو سـوفیانە، لـەو بارەیـەوە دەڵێت: «وأمـا الرافضـي فـإذا قـدح فـي معاويـة رضـي الله

عنـه بأنـه كان باغيـاً ظالمـاَ، قـال لـه الناصبـي : وعلـي أيضـا كان باغيـا ظالمـاً لمـا قاتـل المسلمين وبدأهـم بالقتـال وصـال عليهـم، وسـفك دمـاء الأمـة بغيـر فائـدة لهـم لا فـي دينهـم ولا فـي دنياهـم! وكان السـيف مسـلولا فـي خلافتـه علـى أهـل الملـة! مكفوفـا عـن الكفـار"[٦]
(ئەگـەر رافیزیـەک تانـەی لـە موعاویـە دا، گوایـە سـتەمکار وباغییـە (ئـەوە هـەر قسـەی ڕافیـزە نیـە بـە پێـی فەرمـودەی سـەحیح موعاویـە لـە فیئـەی باغیـەدا بـوو) ئـەوە ناسـیبیەکە پێـی دەڵێت: عەلیش سـتەمکار وباغـی بـوو، بـەوەی کـە دژی موسـڵمانان جەنـگا لـە پێنـاو دەسـەڵات، وئـەو دەسـتی بـە شـەڕ کـرد، وهێرشـی بـۆ بـردن، وخوێنـی ئـەو ئومەتـەی ڕشـت بەبێ هیـچ سـودێکی دیـن ودونیایان! وشمشـێرەکان لە خیلافەتی ئـەودا لـە دژی موسـڵمانان هەڵکێشـرا بـوو، لـە کافـران بـە دوور بـوو)
چاودەنێ ئـەو قسـانەی کـە لەسـەر دەمـی ناسـیبیەکە دەکرێـت هەمـان ئـەو تۆمـەت وتوانجانەیـە کـە ابـن تیمیـە بـەر لـەو خاڵـە هەڵیدەڕشـتن. ئـەوە چاکتریـن دان هێنانـە بـە ناسـیبیەتی خـۆی.

لە شوێنێکی تر بە هەمان تاکتیک دەڵێ:
"فـإن جـاز للرافضـي أن يقـول إن هـذا كان طالبـا للمـال والرياسـة أمكـن الناصبـي أن يقـول كان علـي ظالمـا طالبـا للمـال والرياسـة قاتـل علـى الولايـة حتـى قتـل المسـلمين بعضهـم بعضـا ولـم يقاتـل كافـرا ولـم يحصـل للمسـلمين فـي مـدة ولايتـه إلا شـر وفتنـة فـي دينهـم ودنياهـم " [٧]
(ئەگـەر بـۆ ڕافیزیەکـە جایـز بێـت بڵێـت کـەوا ئـەو بـە دوای پـول ودەسـەڵات کەوتبێـت، ناسـیبیەکیش دەتوانێـت بڵێـت عەلـی سـتەمکار بـوو وبـە دوای پـول ودەسـەڵات کەوتبـوو. شـەڕی کـرد لـە پێنـاو دەسـەڵات وویلایەتـی هەتـا موسـڵمانان بەربونـە گیانـی یەکتـر بـە کوشـتن، وشـەڕی لەگـەڵ کافرێکیـش نەکـرد، وموسـڵمانان لـە شـەڕ وفیتنـەی دیـن ودنیایـان زیاتـر هیچیـان دەسـت نەکـەوت لـە کاتـی ویلایەتـی ئـەودا)!
پێشێلی حەدیسی سەحیحی بوخاریش!
مەسـەلەی ڕقەکـە وای لێدەکات هەمـوو شـتێکی حەزرەتـی عەلـی ڕەتبکاتـەوە، هەتـا ئەگـەر لـە سـەحیحی بوخاریشـدا هاتبێـت، کـە ئـەوەش ڕوخاندنـی کۆڵەگەیەکـی تـری تیـۆری سـەلەفییەتە سـەبارەت بـە ترسـناکی ڕەتکردنـەوەی حەدیسـی سـەحیح! دەربـارەی سـیفەتێکی زانسـتی قـەزا لای حەزرەتـی عەلـی دەڵێـت: قـال رسـول اللـه « أقضاكـم علـي « والقضـاء يسـتلزم العلـم والديـن، فهـذا الحديـث لـم يثبـت وليـس لـه إسـناد تقـوم بـه الحجـة « [٨]

(دەربارەی ئەو قسەیەی كە دەڵێت پێغەمبەر وتویەتی (عەلی لە هەمووتان شارەزاترە لە قەزاوەت) قەزاوەت پێویستی بە عیلم ودینە ئەو حەدیسە نەسەلمێنراوە وسەنەدێكی نیە ببێتە حوجەت)
بڕوانە چۆن تانە لە عیلم وشارەزایی ودینی حەزرەتی عەلی دەدات، كە دەڵێت « والقضاء يستلزم العلم والدين « وەک بڵێی عەلی ئەو دوو خەسڵەتەی نەبێت، هەرچەندە حەزرەتی عومەر دەڵێت:»واقضانا علي( عەلی لە هەموومان شارەزاترە لە قەزاوەت) « وەک لە سەحیحی البخاری دا هاتوە.
بەڵكو پایەی ئەو یەكسان دەكات بە پایەی معاویە ویەزید وخەلیفەكانی ئومەویەكان وعەباسیەكان! لەو بارەیەوە دەڵێت:» :» إن الرافضة تعجز عن إثبات إيمانه وعدالته، فإن احتجوا بما تواتر من إسلامه وهجرته وجهاده، فقد تواتر إسلام معاوية ويزيد وخلفاء بني أمية وبني العباس وصلاتهم وصيامهم وجهادهم الكفار .“[٩]
( رافیزیەكان ناتوانن ئیمان وعەدالەتی (حەزرەتی عەلی) بسەلمێنن، ئەگەر بەڵگەیان هێنایەوە بە تەواتری ئیسلامی، وكۆچ كردنی وجیهادی، ئەوە ئیسلام ونوێژ وجیهادی معاویە ویزید و وخەلیفەكانی ئومەوی وعەباسیەكانیش موتەواترە!!»
كەوابوو حەزرەتی عەلی هیچ فەرقێكی نیە لەگەڵ فاسقێكی وەک یەزی،د بە شەهادەی دەیەها سەحابی وتابیعی وزانای سەردەمی خۆی، ئەوە باسی خەلیفەكانی تری عەباسی وئومەوی هەر ناكەین.
هەر لەو بوغزەوە حەزرەتی عەلی دەكاتە هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە:
”وقد أنزل الله تعالى في علي: يا أيها الذين ءامنوا لا تقربوا الصلاة وأنتم سكارى حتى تعلموا ما تقولون. سورة النساء. لما صلى فقرأ وخلط..“[١٠]
(خوا دەربارەی عەلی ئەو ئایەتەی سەرەوەی دابەزاندوە، كاتێ نوێژی كرد وقورئانی خوێند وتێكەڵ وپێكەڵی كرد)!!
ئێمە كە داوەری سەلەفیەكان دەكەین بۆ تیۆرە سەرەكیەكانی خۆیان، مانای ئەوە نیە باوەڕمان بەو تیۆرانە و بەو شێوازەی بیركردنەوەی ئەوان هەبێت، بەڵام دەمانەوێت بیسەلمێنین كە ئەوان چەندە ناكۆكن بە بنەما تیۆری و فیكریەكانی خۆشیان. كە بەرگریش لە حەزرەتی عەلی دەكەین، لە گۆشە نیگای شیعیەوە ناڕوانینە كێشەكان، كە حەزرەتی عەلی بەقەد نیمچە خوایەک تەقدیس دەكەن ووەک سوپەر مانێک بۆی دەڕوانن، دەكرێت ڕەخنەی لێ بگیرێت، بەڵام ناكرێت

لە پایەی دینی ومرۆیی یەکێکی وەک عەلی کەمبکرێتەوە، لەسەر حیسابی ڕوو سپیکردنەوەی کەسانێکی وەک معاویە و یەزید، کە گوناهە بە بیریشت تێپەڕێت بەراوردیان بە عەلی پێ بکرێت!
ئەوەیە ابن تیمیەی حەقیقی لە ڕووی سونە وسەلەفییەت دا، ئەو سەلەفیانەی گوێیان لێ نیە دەریایەک خوێن بڕێژن بۆ ئەوەی قسەیەک بە معاویە یان یەزیدی قاتیل وفاسیق نەگوترێت، کەچی ئەو ابن تیمیەی بەشێخی ئیسلام وناسری سونە وچەند لەقەبی تری کش وفش دادەنێن، بەو شێوەیە سووکایەتی بە حەزرەتی عەلی دەکات!

## دەمارگرژی بۆ ابن تیمیە

وەک نموونە بۆ دەمارگرژی بۆ ابن تیمیە (ابن کثیر) ئیبن کەسیر وەردەگرین. ئیبن کەسیر لە مێژووەکەی کە باس دێتە سەر باسی هەر زانایەکی غەیری سەلەفی یان لەوانەی کێشەکیان هەبوو بێت لەگەڵ ابن تیمیە زۆر بە شێوەیەکی نا عادیلانە قسەیان لەسەر دەکات وهەڵیان دەسەنگێنێ.
بۆ نمونە کە باسی زانا وفەقیە وموفتی وموحەدیسەکی وەک (الشیخ صدر الدین محمد بن عمر بن مکی) ناسراو بە (ابن المرحل یان ابن الوکیل الشافعی) دەکات، کە لە ساڵی ٧١٦ هیجری کۆچی کردوە. کە چەندین مونازەرەی هەبوە لەگەڵ ابن تیمیە لە چەندین بۆنەدا، هەرچەندە زانایەکی گەورەی وەک تاج الدین السبکی ستایشی عیلم وکەسایەتی دەکات، کەچی ابن کەسیر بەو جۆرە باسی دەکات:
« وقد كان مسرفاً على نفسه قد ألقى جلباب الحياء فيما يتعاطاه من القاذورات والفواحش، وكان ينصب العداوة للشيخ تقي الدين ابن تيمية ويناظره في كثير من المحافل والمجالس "[١١]
( پەردەی شەرم وحەیای فڕێ دابوو، بەو شتە پیس وپۆخڵانەی کە دەیخوارد ودەیکرد، وهەردەم دوژمنایەتی ابن تیمیەی دەکرد ومونازەرەی لەگەڵدا دەکرد لە کۆڕ ومەجلیسەکاندا )
وادیارە پڕوپاگەندەی ناوزڕاندنی ئەو زانایە هێندە گەورە بوە، بۆیە تاج الدین السبکی دەربارەی دەڵێت:

"ولـه مـع ابـن تيميـة المناظـرات الحسـنة، وبهـا حصـل عليـه التعصـب مـن أتبـاع ابـن تيميـة، وقيـل فيـه مـا هـو بعيـد عنـه، وكثـر القائـل فارتـاب العاقـل"[١٢].

( مونازەراتـی چاکـی هەبـوە لەگـەڵ ابـن تیمیـە، سـەبارەت بـەوە، کەوتـە بـەر ڕقـی دەمارگـرژی شـوێن کەوتوانـی ابـن تیمیـە، کـە دەربـارەی قسـەی وا گوتـراوە، دوورە لـەو، هێنـدە قسـەی زۆری لەسـەر کـرا هەتاعاقڵیـش تێیـدا دەکەوتـە گومانـەوە) دەربـارەی زانایەکـی تـر کـە بـەو جـۆرە وەسـف دەکرێت»الإمـام قاضـي القضـاة الشـيخ شـمس الديـن أبوالعبـاس أحمـد بـن إبراهيـم السّروجي الحنفي المتوفى سـنة ٧١٠ هــ .»زانایەکـی وەک (ابـن تغـری بـردی) لەبارەیـەوە دەڵێـت :

"وكان بارعـاً في علـوم شـتى ولـه اعتراضـات علـى ابـن تيميـه في علـم الكلام» . (لـە جۆرەهـا زانسـتدا بلیمـەت بـوو، وچەندیـن ڕەخنـە لـە ابـن تیمیـە هەبـوو دەربـارەی عیلمـی کـەلام)

هەروها (ابن حجر العسقلانی) دەربارەی دەڵێت:

"ومـن تصانيفـه : الـرد علـى ابـن تيميـة، وهـو فيـه منصـف متـأدب صحيـح المباحـث، وبلـغ ذلك ابـن تيميـة فتصدى للـردّ علـى ردّه"[١٣].

(لـە نێـو دانراوەکانـی وەڵامـی ئیبنـول تەیمیـەی داوەتـەوە، کـە تێیـدا زۆر مونسـیف وبـە ڕەوشـت وبـە لێکۆڵینـەوەی ڕاسـت ڕەخنەکانـی نوسـیوە، کـە هـەواڵ گەیشـتە ابـن تیمیـە وەڵامـی وەڵامەکـەی ئـەوی دایـەوە)

لە کتێبێکی تر دەڵێت:

"وله رد على ابن تيمية بأدب وسكينة وصحة ذهن ورد ابن تيمية على رده"[١٤].

(وەڵامێکـی هەیـە لەسـەر ابـن تیمیـە، بـە ئـەدەب ولەسـەرخۆ وزەینێکـی دروسـت نوسـیویەتی، وابـن تیمیـەش وەڵامـی وەڵامەکـەی ئـەوی داوەتـەوە)

ابن کثیر بەگاڵتەوە باسی دەکات ودەڵێت:

"ولـه اعتراضـات علـى الشـيخ تقـي الديـن ابـن تيميـة فـي علـم الكلام، أضحـك فيهـا علـى نفسـه وقد ردّ عليـه الشـيخ تقـي الديـن في مجلدات وأبطـل حججـه "[١٥].

(چەنـد ڕەخنەیەکـی هەیـە لەسـەر ابـن تیمیـە لـە زانسـتی کەلامـدا، خـۆی کردۆتـە مایـەی پێکەنینـی خەڵـک، شـێخ تقـی الدیـن (ابـن تیمیـە) بـە چەندیـن موجەلـەدات وەڵامـی دایـەوە، وبەڵگەکانـی پوچـەڵ کـردەوە)

دەربـارەی (الإمـام الشـيخ تـاج الديـن أحمـد بـن محمـد بـن عطـاء اللـه الاسـكندري المالكـي، المتوفـى ٧٠٩ هــ .) کـە زانایەکـی حەنبەلیـش بـوە دەڵێـت:

" قليل العلم، مزجى البضاعه "»کەم زانست وچی لەباردا نییە –کەل وپەلی بێ بازاڕە»
کەچی زەهەبی (الذهبي) کە هەوادارێکی ابن تیمیەش بوو دەربارەی ئەو زانایە دەڵێت:
"رأيتە بالإسكندرية فيما أرى، وكان يتكلم على الناس ويقول أشياء نافعة وله عبارة عذبة وفيه صدق، وله مشاركة في الفضائل، ولكنه كان من كبار القائمين على الشيخ تقي الدين ابن تيمية "[١٦].
«لە ئەسکەندەریە دیتم، بۆ خەڵک دەدوا وشتی بە سودی دەگوت، ودەربڕینەکانی شیرین بوون، وڕاستگۆیی تێدا بوون، بەژداری هەیە لە کاروباری چاک، بەڵام لە هەرە نەیارانی ابن تیمیە بوو» هەر لە شوێنێکی تر دەڵێت:
"القاضي الشيخ الإمام قاضي القضاة شرف الدين عبدالغني بن يحيى ... من كبار الرؤوس ... وكان متوسطاً في المذهب، محمود السيرة، كثير المكارم"[١٧].
«قازی شێخ ئیمام وقازی قازیەکان شەرەفەدین عەبدولغەنی کوڕی یەحیا، لە پیاوە هەرە گەورەکانە، میانەڕەو بوو لە مەزهەبدا، وباس وخوازی چاک بوو، زۆر جوامێر بوو»

## نامە گرنگ و پڕ بەهاکەی زەهەبی بۆ ئیبن تەیمیە!

ئەو زەهەبیە کە وتم لە هەوادارانی ابن تیمیە بوو، لەو قسانەی سەرەوە دەردەکەوێت، کە تا ڕادەیەک نەرمتر بوە لە ابن تیمیە، وهەتا لە دەقێکدا وەک پەیامێکی کراوە بۆ ابن تیمیەی نوسیوە بەناوی ( النصيحه الذهبيه ) زۆر بە ئاشکرا ڕەخنەی توندی ئاڕاستە دەکات.
ئەو پەیامە هەر بە دەسخەتی خودی زەهەبی لە (دار الكتب المصرية) پارێزراوە، هەروەها ئیمامی حافیز سەخاوی (الإمام الحافظ السخاوي) لە کتێبی ( الإعلان بالتوبيخ لمن ذم التاريخ) باسی کردوە، هەوڵ دەدەم کورتەی نامەکە باس بکەم:
بسم الله الرحمن الرحيم
الحمد لله على ذلتي، يا رب ارحمني وأقلني عثرتي. واحفظ علي إيماني... طوبى لمن شغله عيبه عن عيوب الناس وتبا لمن شغله عيوب الناس عن عيبه. إلى كم

تری القذاة في عين أخيك وتنسى الجذع في عينك؟ إلى كم تمدح نفسك وشقاشقك وعباراتك وتذم العلماء وتتبع عورات الناس مع علمك بنهي الرسول صلى الله عليه وسلم : » لا تذكروا موتاكم إلا بخير فإنهم قد أفضوا إلى ما قدموا « . بلى أعرف إنك تقول لي لتنصر نفسك: إنما الوقيعة في هؤلاء الذين ما شموا رائحة الإسلام ولا عرفوا ما جاء به محمد صلى الله عليه و سلم وهو جهاد...يا رجل بالله عليك كف عنا فإنك محجاج عليم اللسان لا تقر ولا تنام... وكثرة الكلام بغير زلل تقسي القلب إذا كان في الحلال والحرام فكيف إذا كان في العبارات اليونسية والفلاسفة وتلك الكفريات التي تعمي القلوب؟ والله قد صرنا ضحكة في الوجود ، فإلى كم تنبش دقائق الكفريات الفلسفية لنرد عليها بعقولنا.

يا رجل قد بلعت سموم الفلاسفة ومصنفاتهم مرات، وبكثرة استعمال السموم يدمن عليها الجسم وتكمن والله في البدن . .. كان سيف الحجاج ولسان ابن حزم شقيقين فواخيتهما !

يا مسلم أُدم حمار شهوتك لمدح نفسك، إلى كم تصادقها وتعادي الأخيار؟ إلى كم تصدقها وتزدري بالأبرار؟ إلى كم تعظمها وتصغر العباد؟ إلى متى تخاللها وتمقت الزهاد؟ إلى متى تمدح كلامك بكيفية لا مدح بها والله أحاديث الصحيحين، يا ليت أحاديث الصحيحين تسلم منك بل في كل وقت تغير عليها بالتضعيف، والإهدار، أو بالتأويل والإنكار.

أما آن لك أن ترعوي، أما حان لك أن تتوب وتنيب، أما أنت في عشر السبعين وقد قرب الرحيل، بلى والله ما أذكر أنك تذكر الموت بل تزدري بمن يذكر الموت، فما أظنك تقبل على قولي ولا تصغي إلى وعظي بل لك همة كبيرة في نقض هذه الورقة بمجلدات وتقطع لي أذناب الكلام ولا تزال تنتصر حتى أقوالك "[١٨].

(خۆشبەختی بۆ ئەوانەی لە جیاتی بە عەیب ونەنگی خەڵکەوە خەریک بن بە عەیب و نەنگی خۆیان خەریک دەبن، تیا چوونیش بۆ ئەوەی لەبەر نەنگی وعەیب وعاری خەڵک ئاگای لە عەیبەکانی خۆی نامینێت، تاکەی جیق لە چاوی براکانت دەبینیت وکۆتەرە لە چاوی خۆت نابینیت؟ تا کەی ستایشی خۆت و شەقشەقەکانت وگوزارشەکانت دەکەیت، وزەمی زانایان دەکەیت، وبەدوای عەیب وعاری خەڵک دەکەویت، هەرچەندە دەزانیت کە پێغەمبەر نەهی لێکردوە...

بەڵێ دەزانم بۆ پشتگیری کردن لە خۆت پێم دەڵێیت: قسە گوتن بەوانەی کە

بۆنی ئیسلامیان نەکردوە، وئەوەی محەمەد (سەلامی خوای لێ بێت) هێناویەتی نایناسن جیهادە... پیاوی چاک بە وازمان لێ بێنە, تۆ زمان زان وبەڵگەحازر ودناسەکنێی وناخەویت...زۆر وتنیش بەبێ غەڵەتیش دڵ ڕەقت دەکات، ئەگەر لە بارەی حەرام وحەلالیش بێت، چ جای لەوەی دەربارەی گوزاریشی یونسی وفەیلەسوفەکان وئەو کوفریاتانە بێت کە دڵەکان کوێر دەکەن؟

بەو خوایە بوینە قەشمەر جاری ئەو بونەوەرە، تاکەی بچوکترین کوفریاتی فەلسەفی هەڵدەکۆڵی بۆ وەڵامدانەوەیان بە عەقڵمان. ئەی پیاو ژەهری فەیلەسوفان ودانراوەکانیانت چەندین جار قوت داوە، زۆر بەکارهێنانی ژەهریش جەستە ڕادەهێنیت وخوی پێوە دەگرێت و داگیری دەکات...شمشێری حەجاج وزمانی ابن حزم لێک جیا بوون تۆ کردتنەوە بە برا!! ئەی موسڵمان گوێدرێژی ئارەزوەکانت بەرهەڵدا بکە بۆ ستایش کردنی خۆت، تا کەی هاوڕێیەتی دەکەیت ودژایەتی پیاو چاکان دەکەیت؟

تا کەی باوەڕی پێ دەکەیت وگاڵتە بە پیاوچاکان دەکەیت؟ تا چەندی تر خۆت گەورە دەکەیت وبەندەکانی خوا بچوک دەکەیتەوە؟ تاکەی ستایشی قسەکانت دەکەیت، بە جۆرێ قەسەم بە خوا حەدیسەکانی دوو کتێبە سەحیحەکانیش وا ستایش نەکراون، خۆزگە حەدیسەکانی ئەو دوو سەحیحەش لە دەستی تۆ ڕزگاریان بوایە، چونکە هەردەم هەڵمەتیان دەکەیتە سەر بە زەعیف کردنیان، وبە فیرۆدان، ولێکدانەوە (تەئویل) ونکولی کردن لێیان. باوەڕ ناکەم قسەکانم لێ وەرگریت وگوێ بۆ مەوعیزەکەم بگریت، چونکە زۆر بە هیمەتی وبە تاقەتی بۆ وەڵام دانەوەی ئەو کاغەزەم، بە چەندین موجەلەد وقسم پێ ببڕیت وبەردەوامیت لەسەرکەوتن بۆ قسەکانت...

کاتی ئەوە نەهاتوە پاشگەز بیتەوە، کاتی ئەوەت نەهاتوە تۆبە بکەیت وبگەڕێیتەوە، ئەی تۆ لە دەیەمی ساڵی حەوتا ساڵان نیت، کە کۆچ کردنت نزیک بۆتەوە. باوڕناکەم گوێم بۆ بگریت و گوێ لە مەوعیزەکەم بگریت، بەڵکو هیمەتێکی مەزنت هەیە ئەو لاپەڕەیە ئامۆژگاریەی من وەڵامدەیتەوە بە چەندین موجەلەدات، سەروگوێی قسەکانم ببڕیت...

پێم وایە کەس لە خاوەنی ئەو نامەیە چاکتر ابن تیمیەی نەناسیوە.

بەشی پێنجەم.. حوزەیرانی ٢٠٠٨ گۆڤاری ستاندارد

## ژێدەرەكان

[١] - طلقاء بەوانە دەگوترێت كە تادوا ساتى توانايان دژى پێغەمبەر جەنگان، وبە ناچارى لەكاتى فەتحى مەككەدا بوونە موسڵمان.

[٢] - ئەوة دەقي قسەكەيەتي: مناقشة ما ورد عن ابن عمر في ذلك وعلى هذا يخرج فعل ابن عمر رضي الله عنهما، بأن النبي صلى الله عليه وسلم كان يصلي في تلك البقاع التي في طريقه، لأنها كانت منزله، لم يتحر الصلاة فيها لمعنى في البقعة. فنظير هذا: أن يصلي المسافر في منزله، وهذا سنة. فأما قصد الصلاة في تلك البقاع التي صلى فيها اتفاقا، فهذا لم ينقل عن غير ابن عمر من الصحابة، بل كان أبو بكر وعمر وعثمان وعلي، وسائر السابقين الأولين، من المهاجرين والأنصار، يذهبون من المدينة إلى مكة حجاجا وعمارا ومسافرين، ولم ينقل عن أحد منهم أنه تحرى الصلاة في مصليات النبي صلى الله عليه وسلم. ومعلوم أن هذا لو كان عندهم مستحبا لكانوا إليه أسبق، فإنهم أعلم بسنته وأتبع لها من غيرهم. وقد قال صلى الله عليه وسلم: «عليكم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين المهديين من بعدي، تمسكوا بها، وعضوا عليها بالنواجذ، وإياكم ومحدثات الأمور فإن كل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة". وتحري هذا ليس من سنة الخلفاءالراشدي ن، بل هو مما ابتدع، وقول الصحابي إذا خالفه نظيره، ليس بحجة، فكيف إذا انفرد به عن جماهير الصحابة؟. أيضا: فإن تحري الصلاة فيها ذريعة إلى اتخاذها مساجد والتشبه بأهل الكتاب مما نهينا عن التشبه بهم فيه وذلك ذريعة إلى الشرك بالله.

[٣] منهاج السنة النبوية في نقض كلام الشيعة والقدرية (١٩١/٦-١٩٢)، شيخ الإسلام بن تيمية، دار النشر مؤسسة قرطبة، سنة النشر ١٤٠٦، الطبعة الاولى. زياتر ثشتم بةو نوسخةية بة ستوة بؤ دةرهيَناني دةقةكان، كة لةسة تؤرِى ئينتةرنيَت دةستم كةوت، هةرضةند نوسخةيةكى تري نوسراوم لاية لة ضاثي المكتبة العلمية،دار الكتب العلمية- بيروت. سالَي ضاثي لةسةر نية.

[٤] - المنهاج (٥١٧/٥)

[٥] - المنهاج (٥٣/٧ – ٥٤)

[٦] - المنهاج (٣٨٩/٤) :

[٧] - منهاج السنة ( ٦٠/٢)

[٨] - منهاج السنة (ج٤ /١٣٨ )

[٩] - منهاج السنة (٦٢/٢)

[١٠] – منهاج السنة (٢٣٧/٧)

[١١] – البداية والنهاية، ج٢ ص ٢١٤٦ .

[١٢] – طبقات الشافعية الكبرى، مصدر سابق، ج ٥ ص ١٤١ .

[١٣] – رفع الإصر عن قضاة مصر، ابن حجر العسقلاني، ص ٤٢، ط الأولى، مكتبة الخانجي، مصر، ١٤١٨ هـ

[١٤] – الدرر الكامنة، مصدر سابق، ص ٩٢ .

[١٥] – البدايةو النهاية، مصدر سابق، ج٢ ص ٢١٣٦.

[١٦] – ذيل تاريخ الإسلام، الذهبي، ص ٨٦، ط الأولى، دار الكتاب العربي، بيروت، ١٤٢٤ هـ .

[١٧] – ذيل تاريخ الإسلام، مصدر سابق، ص ٩٢ .

[١٨] مجموعة العقيدة وعلم الكلام، محمد زاهد الكوثري، ص ٥٥٥، ط الأولى، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٥ هـ / وكتاب التوفيق الرباني، جماعة من العلماء، ص ٢٠٣ / وكتاب الفتاوى السهمية، مصدر سابق، ص ٦٦ / وكتاب السلفية الوهابية، مصدر سابق، ص ١٣٤ .

[١٩] مجموعة العقيدة وعلم الكلام، محمد زاهد الكوثري، ص ٥٥٥، ط الأولى، دار الكتب العلمية، بيروت، ١٤٢٥ هـ / وكتاب التوفيق الرباني، جماعة من العلماء، ص ٢٠٣ / وكتاب الفتاوى السهمية، مصدر سابق، ص ٦٦ / وكتاب السلفية الوهابية، مصدر سابق، ص ١٣٤ .

## ئامارێکی تر لەسەر کتێبی بەناوبانگی
## «مجموع الفتاوی» ابن تيمية

هەندیک لەو شێخ ومەشایخ و بەڵکو بانگخوازیش بە ئاشکرا درۆی گەورە دەکەن بۆ فریودانی عەوامە گوێ لە مشتەکان، ئیسلامیەکی ناودار هەبوو، ئەگەر بیویستبا درۆیەک بە دەمی زانایەکی ئیسلام بکات، دەیگووت ابن فلان لە فلانە کتێب و بەرگی دووەم، لاپەڕە ١٣٢ واو وا دەڵێت. برادەرێکی فزوڵی و مونجیرێش جارێکیان بە سودفە، هەرچەندە سودفەش نیە! کتێبێکی خوێندبۆوە ئەو سەرکردەیە، بۆ زیاتر موعجیبکردنی مندار وتارو نەخوێندەواران دیسان نمونەیەکی باس کردبوو لەو کتێبەی برادەرە مونجرەکە کە تازە خوێندبویەوە، و گوتبووی لەو کتێبە چاپی ساڵی فلان، لاپەڕەی ژمارە فلان، لە پێنج هێڵی کۆتایی لاپەڕەکە، واو وا دەڵێت!! پەکوو لەو دیقەتەی، لەوێ لە ئیعجاب وسەرسامیان بۆی هەندێک مندار وتار شاگەشکە ببوون وخەریک بوو تێکڕا هاوارکەن: تەکبیر!!!
کابرای فزوڵی مونجیریش، فزوڵیەکەیی و مونجیریەکەی زیاتر زیادی کردبوو، چونکە کتێبەکەی خوێندبوەوە شتی وای نەک لەو لاپەڕەیە، بەڵکو لە هەموو کتێبەکە بەرچاو نەکەوتبوو!! کە گەڕابۆوە ماڵەوە دیسان هەموو کتێبەکەی سەراوبن کردبوو شتی وای تیدا نەدۆزیبوەوە، چو بوو چەندین کاسێتی خوتبە ئاگرینەکانی هێنابوو، چەندین ئیدیعاکردنی کتێب و ژمارەی لاپەڕ وچاپی دەرهێنابوو لە وتار و خوتبە مندار تڕێنەکانی، زۆر بە مونجیرێی بەدوای داچوو بوو، بۆی دەرکەوتبوو هەمووی درۆیە!! ئەو سەرکردەیە ویستبێتی درۆیەک بۆ بنکردەی عەوام فریوی بکات ئەو تەکنیکە بەکار دەهێنیت!!!
وامزانی ئەوە بەس لەناو کورد و موسلمانانی ئەو زەمانە روویداوە، دوایی بۆم دەرکەوت کە ئیبن تەیمیە باوکی شەرعی داعش و لەوان داعشرەوتریش تەکنیکێکی نزیک لەوەیدا بەکارهێناوە، ئەویش ئەوەیە هەر قسەیەکی کردوە و بڕیارێکی داوە یەکسەر دەلیت ئەوە ئیجماعی موسڵمانانی لەسەرە، بە ئیتیفاقی ئەهلی سونە و بە ئیجماعی سەلەف وئیتیفاقی فوقەهاکان، وهتد....
لە پاش ئامارێک دەربارەی وشەکانی کوشتن و لە گەردندان و هەموو جۆرەکانی تری کوشتن، لە ئامارێکی تردا لە کتێبی مجموع الفتاوی دەربارەی ئەو ئیدیعایەنەی

ئیجماعەکان بەبی دەلیل، هەرچەندە ابن حزم الاندلسي هەر لە بنەڕەتدا نکولی لە بوونی ئیجماع و هاودەنگی کرد و نکولی لە هاتنەدی دەکرد لە هەر سەردەمێکدا. ئەوە جگە لەوەی ابن حنبل دەڵێت: «من ادعى الإجماع فهو كاذب» ئەوەی ئیدیعای هاودەنگی و ئیجماعی کرد درۆزنە!! کەچی ابن تيمية قوتابی ابن حنبل سەدان ئیدیعای ئیجماعی سەحابە و فوقەها و ئەهلی سونە و عولەما وسەلەفی کردوە بێ ئەوەی ڕاستیش بێت!!

بە پێی ئەو ئامارە کە لە کتێبی هەرە بەناوبانگی «مجموع الفتاوى» ابن تيمية هاتوە، ئیجماع و موشتەقاتەکانی لەسەر زمانی بەبێ بەڵگە بەو جۆرە هاتووە:

دەستەواژەی «باتفاق المسلمين» ٣٠٣ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «باتفاق العلماء» ١٩٥ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «بإجماع المسلمين» ١٠٢ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «اتفق المسلمون» ٦١ جار هاتووە !!

دەستەواژەی «اتفق العلماء» ٥١ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «أجمع المسلمون» ٣٨ جار هاتووە!!

دەستەواژەی »اتفق الصحابة» ١٤ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «باتفاق الفقهاء» ١٣ جار هاتووە !!

دەستەواژەی «اتفق السلف»١١ جار هاتووە !!

دەستەواژەی «اتفق الفقهاء» ١٠ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «اتفق أهل السنة» ٧ جار هاتووە !!

دەستەواژەی «باتفاق الصحابة» ٦ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «أجمع أهل العلم» ٦ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «بإجماع العلماء» ٥ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «بإجماع السلف» ٤ جار هاتووە!!

دەستەواژەی «أجمع العلماء» ٤ جار هاتووە!!

ئێستا بەڕای من دەبێت ئیجماعی موسڵمانان لەسەر ئەوە بێت کە ابن تيميه بە درۆ ئیدیعای ئیجماعی موسڵمانانی کردوە لە سەدان وهەزاران مەسایلی دینیدا!!

## ئایە ئیبن تەیمیە ی باوکی توندوتیژی سەلەفیزم کورد بوو؟!

کوردێکی موسڵمان وئیسلامی سەلەفی زۆر دڵ بەوە خۆش دەکەن کە ئیبن تەیمیە کوردە و خەڵکی حەرانە. بەرلەوەی باسی ئیبن تەیمیە بکەین وەک بیردۆزەرێکی یان مونەزیرێکی عروبەتی سەلەفی، خراپ نییە بەدواداچوونێک بکەین بۆ بانگەشەی کوردبوونی ئیبن تەیمیە، بزانین بەڵگەی ئەوانەی پێیان کوردە بەهێزترە یان بەڵگەی ئەوانەی پێیان عەرەبێکی ڕەسەنە، هەرچەندە بەڕای من ئەگەر کوردیش بێت، بیر و ڕوح و خوێنی بە عروبەت داگیرکراوە، بەڵام هەر پێشم وانیە کورد بێت.

ئەوەی یەکەم جار باسی کوردبوونی ئیبن تەیمیەی وروژاند پێموابێت ئیمام محمد ابو زهرة بوو لە کتێبی [ ابن تيمية، حياته و عصره – آراؤه و فقهه] ل ١٨، کە دەڵێت: «ئەو مێژونووسانەی کە باسیان کردوە، خێزانی ئیبن تەیمیە یان نەداوەتە پاڵ قەبیلەتێک، بەڵکو تەنها دایانەتە پاڵ حەڕان کە شوێنی یەکەمی ژیانی خێزانی بووە، وەک عەرەب نەیانداوەتە پاڵ عەشیرەت وقەبیلەیەک، ئەوەش دەیسەلمێنێت کە عەرەب نەبووە، ونەدراوەتە پاڵ هیچ قەبیلەیەکی عەرەبی، بۆیە دەتوانین تێبگەین و وا گومان ببەین کە عەرەب نەبووە، لەوانەیە کورد بوو بێت.

کە قەومێکی بە هیمەت و ئازا وبە تەنگەوەهاتوون، و ڕەوشتیان بە هێزە و توندی تێدایە. ئەو سیفەتانە بە ڕوونی لە ئیبن تەیمیە دابوو، هەرچەندە لە ژیان هێمنی زانایان، و ئاسودەیی بیرمەندان، و لەسەرخۆیی موحەقیقان ژیا بوو. هەروەها کورد لە سەدەی شەشەم و حەوتەم هەڵوێستی جوانیان هەبوو لە بەرگریکردن لە ئیسلام و موسڵمانان، لە بەرەی یەکەمی ئیسلام وەستا بوون لە دژی خاچپەرستان، و زەبری یەکەم بەر ئەوان کەوت و دوایی چەندین چەپۆکیتریان بەر کەوت، بەڵام بەرەنگاربوونەوەیان خاچپەرستانی بێ ئومێد کرد لە زاڵبوون بەسەر ئیسلامدا، یان بەلایەنی کەمەوە توندئاژۆییەکەیان تێکشکاند وهەیبەتیان نەهێشتن هەتا کورد و دوایی میسریەکان بە تێکشکاوی ناردنیانەوە بۆ وڵاتانی خۆیان.» دار الفكر العربي، ١٩٧٤، ل ١٨

لەوەدەچێت ئیمام ابو زهرة دەستی بە هەموو سەرچاوەیەکی مێژوویی نەگەیشتبێت دەنا سەرچاوەیتر هەیە باسی نەسەبی کردبیت وەک عەرەب!

حمدی عبدالمجیدی سەلەفی یش، کە زانایەکی سەلەفی کورد بوو، ئەو قسەیەی ابو زهرە دوبارە دەکاتەوە ودەڵێت ئیبن تەیمیە کوردە چونکە تەنها کورد بەناوی شوێنزادەی، ناوی خۆی دەنێت، بە پێچەوانەی عەرەب کە بەناوی قەبیلەکانیان ناوی خۆیان دەنێن!

بەڵام ئەو ئیدیعایە بە دڵی هەموو کەسێک نییە، زۆر بابەت وکۆمێنتم دیوە تا ڕادەی گاڵتە پێکردن بە کورد، ڕەدی کوردبوونی ئیبن تەیمیە دەدەنەوە، زۆرجار عەرەبی سەلەفیم دیوە زۆر بە توندی ئەو ئیدیعایە ڕەت دەکاتەوە، وابزانم بەپێی تێڕوانینی عەرەبی دینی ئیبن تەیمیە یان پێ خەسارە کورد بێت، چونکە وەک سەرنجمان داوە وێنەی کورد لە توراس و کەلەپوری عەرەبی ئیسلامیش تابلێی وێنەیەکی شێوێندراوە، کورد بەدرێژایی مێژووی عەرەب، بە دەگمەن نەبێت، وتەیەکی باشی لەسەر نەنوسراوە!

هەردەم وەک زۆڵەکانی زینای نێوان کەنیزەکانی سلێمان پێغەمبەر و جنۆکەکان تەماشایان کراوە، یان وەک میللەتێکی بێ کۆنترۆڵ وخەریک بە دزی وجەردەیی ویاخیبوون وسەرکێشی. وێنەی کورد لە تێڕوانینی عەرەبی زۆر سەرنج ڕاکێشە، بۆیە لە وتارێکی سەربەخۆ باسی دەکەین.

سەیر لەوەدایە کە ئیبن تەیمیە شتێکی گووت بە دڵی عەرەب نەبوو دەڵێن کوردە! لە وتارێک بە ناونیشانی [وهم احترام الخصوصيات] نووسەری سعودی منصور النقيدان، هەندێک قسەی ئیبن تەیمیە بە بەڵگە دەهێنێتەوە دژی بەدوەکان کە بە دژی ئیسلامیان دەزانێت! نووسەرێکیتری سعودی خالد الغنامي لە وتاری [الأعراب أشد كفراً ونفاقاً] وەڵامی توندی نووسەر دەداتەوە ودەڵێت: « لقد أخطأ ابن تيمية ( وهو كردي الأصل بحسب رأي الأغلبية الساحقة من الباحثين المستشرقين ) في أنه قرن بين المشركين والأعراب»

[ئیبن تەیمیە هەڵەی کردوە (کە کوردە لە ئەسڵدا بەپێی ڕای زۆربەی توێژەران لە ڕۆژهەڵاتناسان) بە بەستنەوەی موشریک و ئەعرابەکان! پێیوایە ئەو ڕەگەزپەرستیە دژی ئەعرابەکان، بەدوەکان فەقیهەکان لە ابن تیمیەیان وەرگرتووە!

ابن ناصرالدين الدمشقي لە کتێبی : التبيان لبديعة البيان، الربعي الدمشقي لە کتێبی: الزيادات دەڵێن عەرەب بووە لە قەبیلەی نمیر بووە!

شێخ بكر أبو زيدی سەلەفیش لە کتێبی [المداخل إلى آثار شيخ الإسلام ابن تيمية وما لحقها من أعمال] ل ١٦ دەڵێت:

( نسبته النُميري من إفادات تلميذ تلامذته ابن ناصر الدين ( ٨٤٢ )، وتابعه عليها العدوي في الزيارات، بل هذه النسبة منصوص عليها في بعض رسائل الشيخ المخطوطة على طرر النسخ، وقد ذكر الشيخ ابن قاسم في مقدمة النقض، رسالتين رآهما في الظاهريّة كذلك ص ٣٥ حاشية ١، وهي نسبة إلى بني نُمير، وهم بطن من عامر بن صعصعة بن معاوية بن بكر بن هوازن العدنانية، وذكر القلقشندي في نهاية الأرب ص ٤٣٣ نقلاً عن ابن خلدون : أن منازل بني نُمير في الجزيرة الفراتية والشام، فشيخ الإسلام إذاً )عربي صريح نسباً ولساناً )

«نەسەبی ئیبن تەیمیە نومەیریە بەپیی وتەكانی قوتابیەكی قوتابیەكانی ابن ناصر الدین، العدوي یش لە [الزیارات] هەمان شت دەڵێت، بەڵكو ئەو ڕەچەڵەكە لەسەر هەندێ لە نامە دەستنووسەكانی خودی شێخ نووسراوە، وەک شێخ ابن قاسم لە پێشەكی النقض باسی دوو نامیلكە دەكات، كە لە كتێبخانەی یا دەستنوسخانەی الظاهریة بینیونی... بنی نومەیر یش بەپێی ابن خلدون شوێنیان دەكەویتە جەزیرەی فورات و شام، كەوابوو شێخی ئیسلام عەرەبێكی بێ گەردە بە نەسەب و بە زمان»

كەوابوو زۆر سەرچاوە جەخت لەسەر عەرەب بوونی ئیبن تەیمیە دەكەنەوە، لە كاتێكدا هیچ سەرچاوەیەكی كۆن ئاماژە بۆ كوردبوونی ناكات، كۆنترینیانی ئەو كتێبەی ئیمام محمد ابو زهرەی ئەزهەری میسریە كە لە ساڵی ١٩٧٤ چاپ كراوە. ئەویش سەرەڕای ستایشكردنی كورد وە میللەت، كە ئەوە دەگمەن ڕوودەدات لە نوسراوە عەرەبیەكان، بەڵام هەموو بڕیارەكەی لەسەر زەنێک دامەزراندوە، كە ئەوەیش ئەوەیە عەرەب هەردەم نازناوی بەناوی قەبیلەی دەكات، لەبەر ئەوەی زۆربەیان كۆچەر وگەڕۆک و بەدو بوونە، میللەتانیتر نازناوەكانیان بەناوی شار وشارۆجكەكانیان كردوە، چونكە شارستانی تر بونە، چونكە حەرانیش ناوچەیەكی كوردنشین بووە، بۆیە دەبێت ئیبن تەیمیە كورد بێت!

كێشەكە لەوەدایە زانایان وناودارانی كۆنی كورد و میللەتانیتری ناعەرەب، زۆریان لەبەر شانازیان بە ئیسلام كردنەوە نكوڵیان لە میللەتانی خۆیان كردوە، بەدوای بچوكترین بیانوو گەڕاون تا بڵێن عەرەبن! دەتوانم بڵێم ئەو وەزعە تا سەد، پەنجا ساڵێكیش هەرمابوو، خێزانە دینیەكان هەردەم ڕەچەڵەكیان دەبردەوە سەر عەرەب، شێخ ڕەزایەكی وازمان تێژیش ئیعتراف بە فەزڵی عەرەب بەسەر غەیری عەرەب دەكات! ئیبن تەیمیەش هەتا ئەگەر كوردیش بێت دەتوانم بڵێم داڕێژەرێكی

هـەرە گرنگی تیۆر و داوای باڵادەستی ڕەگـەزی عەرەبـە، و خۆشـەویستی عـەرەب وعەرەبچێتـی بـە بەشـێک لـە ئیمانـی ئەهلـی سـونە وجەماعـەت دەزانێـت. لـە وتـاری داهاتـوو باسـی تیۆری عەرەبچیەتی ئیبن تەیمیـە دەکەیـن، ئـەو کاتـە کوردیش بێت، خۆمـان دەبێـت بڵێین کـورد نییـە!

من لەبـەر یـەک شـت قـەت بـاوەڕ ناکـەم ئیبـن تەیمیـە کـورد بـوو بێـت، ئەویش ئەوەیە کـورد بـە گشـتی سروشـتێکی مرۆیانەتـر و نـەرم ونیانتـری هەبـووە لـەو سروشـتەی تونـد و شـەڕانگێژەی عـەرەب و ئیبـن تەیمیـە. کـورد سـەدان عاریـف و حەکیمـی وەک شـێخی گەیلانـی و سـوهروەردی و ابـن خلـکان و مەحـوی و مەولانـا خالیـد و نورسـی تیـادا هەڵکەوتـوە، کـە تـەژی بـوون لـە مرۆدۆسـتی، هەتـا پیاوێکـی عەسـکەری مەزنـی وەک سـەلاحەدینی ئەیووبـی، سـەرەڕای ئـەوەی ژیانـی هەمـوو لەنـاو شـەڕ وشـۆڕی ناوەکـی ودەرەکـی بـوو، هەرچەنـدە بـێ هەڵـەش نەبـوە وکەسـیش نابـێ، بـەڵام میهرەبانـی و مرۆیـی سـەڵاحەدین بـە هیـچ مونسـفێک و دادپەروەرێـک نکوڵـی لێناکرێـت، ئەوروپـای سـەردەمی خاچپەرسـتیش دانـی پیـادا هێنـاوە!

نـەرم و نیانـی و شـەهامەت و مرۆدۆسـتی ئـەو زۆرجـار سـنوورەکانی ئیسلامیشـی تێدەپەڕانـد لـە ڕەفتـاری لەگـەڵ دوژمـن و دیلـەکان و مەدەنیـەکان، هـەزاران کـچ وژنـی جوانـی ئەوروپایـی خاچپەرسـتانیان دەسـت دەکـەوت بـەو پـەڕی ڕێـزەوە مامەڵـەی دەکـردن و ئـازادی دەکـردن! بـەڵام بەپێـی رای ئیبـن تەیمیـە بێـت ئەوانـە هەموویـان دەبێـت دابـەش بکرێـن بەسـەر موجاهیـدان، وەک داعـش و توندڕەوانیتـر پەیڕەو لـە ئیبـن تەیمیـە دەکـەن لـە ڕەفتـارە توندوتیژەکانیـان.

## ابن تیمیە وسەلەفییەت وعروبەت...

وەک لـەوەو پێـش ئاماژەمـان پێکـرد، سـەلەفییەت ئەگـەر دروسـتکراوی دەسـتی ئومەویـەکان نەبێـت، ئـەوە بونیـادی گشـتی وتیۆرەکانـی لـە ڕاژە و بەرژەوەنـدی ئومەویـەکان بـوە، و تـا ئەمـڕۆش هـەر ئـەو ڕۆڵـە دەگێڕێـت. ئێمـە کـە باسـی ئومەویـەکان دەکەیـن مەبەسـتمان ئـەو مـاوە مێژووییـە نیـە کـە تێیـدا ئومەویـەکان حوکمـی جیهانـی ئیسـلامیان کـردوە، بەڵکـو مەبەسـتمان ئـەو مەنهەجیـەت و شـێوازە تایبەتـەی ئومەویەکانـە، لـە نوسـینەوەی تیـۆری سـەلەفییەت و تەقدیـس کردنـی ئـەو تاکـە شـێوازەیە، و شـەیتەنەکردنی هەمـوو شـێوازەکانی تـری سـەلەفییەتە، لـە نێـو

ئـەو تیۆرانـەی کـە لـە دەرەوەی ئـەو ئـەو بونیـادە ئەمەوییـە بنیـات نـراون.
ئـەو مامەڵەیـەش بـەو ڕادەیـە گەیشـت کـە چەندیـن تەوژمـی سـەلەفی بەرایـی لـە نێوچـون، لەبـەر هێـز وپاڵپشـتی ڕەسـمی دەسـەڵاتی ئومـەوی لـە سـەلەفییەتی ئومەویی! شـتێکی غەریـب نیـە کـە زۆر لـەو پیاوانـەی لـە نێـو جەرگـەی سـەردەمی سـەلەفییەت بـوون لەبـەر لادانیـان لـە بنەمـا تیۆریەکانـی سـەلەفییەتی ئومـەوی، بـەر نەفرەتـی ئـەو مەدرەسـەیە کەوتـوون ومەحـروم کـراون لـە حەمـد وستایشـی ئـەو قوتابخانەیـە.
بێگومـان لەمـاوەی فەرمەنڕەوایـی ئومەویـەکان لـە سـاڵی ٤٠ کۆچـی تـا دواییەکانـی ١٣٢ کۆچـی، ئومەویـەکان بـە گیانێکـی پـڕ لـە دەمارگیـری بـۆ سـێکوچکەی بەنـی ئومەیـە وقورەیـش وعروبـەت هەوڵیـان دەدا. زانـراوەش لـەو سـێکوچکەیە بەنـی ئومەیە لەسـەری لوتکـەی ئەفزەڵیەتـە وئینجـا قورەیش بـە پلـە دوو وئینجـا عروبـەت بـە شـێوەیەکی گشـتی. لـە بـواری ئەفزەڵیەتـی بەنـی ئومەیە توانیان تیۆری سـەلەفییەت بـە ئاڕاسـتەیەک ببـەن، ببێتـە هـۆی تێکـەڵ کردنـی هەمـوو جۆرە سـەحابەکان وپێوانیان بـە یـەک پیـوەر، توانیـان قودسـیەتی یەکێکـی وەک ئەبـو سـوفیان ومعاویـە ویەزیـدی کـوڕی وەک قودسـیەتی یەکێکـی وەک حەزرەتـی عەلـی وعوسـمان وعبداللـەی کـوڕی عومـەر لـە قەڵـەم بـدەن. توانیـان دەمـی هەزارەهـا وملیۆنەهـا کـەس ببەسـتن لـە سەراسـەری جیهانـی ئیسـلامدا بـە نـاوی تیـۆری عەدالەتـی سـەحابە بـە هیـچ جۆرێـک نەتوانـی ئـەو هەمـوو کارەسـاتە مێژووییانـەی ڕویانداوە شـیکردنەوەیەکی ئەقڵانیـان بـۆ بـکات وهـۆکار وتاوانبـارەکان دیـاری بـکات تـا عەدالەتـی سـەحابەکان نەڕوشـێ!.
بـە نسـبەت قورەیشـیش ئـەوە دەیـان فەرمـودە هەیـە دەربـارەی سـەردەسـتی قورەیـش وپێویسـتیەتی فەرمانڕەوایەتـی ئـەوان هەتـا دونیـا مـا بێـت!!! ئـەو فەرمودانـە ئەگـەر هەندێکیـان ڕاسـتیش بـن ئـەوە پەیوەسـتە بـەو هـەل ومەرجـەی کـە تێیـدا هاتـوە وبـۆ ئـەو سـەردەمە بـوە نـەوەک عـەرەب پەرتـەوازە بـن ویەکێـک یـان گروپێـک وقەبیلەیـەک نەبێـت لـە دەوری کۆبنـەوە.
بـە نسـبەت عروبەتیـش ئـەوە گومانـی تێدا نیـە کـە ئومەویـەکان لـە پـاش بازنـەی ئومەویـەت وقورەیشـیەت، پەسـندی عروبیەتیـان دەکـرد، وەک ئەبـو زەهـرە لـە کتێبـی (ابـو حنیفـة حیاتـە وعصـرە) ئامـاژە بـەو حاڵەتـە دەکات و دەڵێت:»ئومەوییـەکان نەزعەیەکـی تونـدی عروبەتیـان تێدا بـوو، زۆر لـە کلتـوری عەرەبـی پێـش ئیسـلامیان زینـدوو کـردەوە.“
تـا ئـەو ڕادەیـەی ئەبـو ڕەیحانـی بەیرونـی دەیگـوت: (پێـم خۆشـترە بـە عەرەبـی

دامشـوڕن وزەمـم بکـەن نـەک بـە فارِسـی مـەدح وسـەنام بکـەن)
قـال أبـي الريحـان البيرونـي: «والله لأَنْ أُهْجـى بالعربيـة، أحـبُّ إلـيّ مـن أن أُمـدح بالفارسـية!“.

ئومەویـەکان لەمـاوەی فەرمانڕەوایەتیـان بیرۆکەی سـەروەری عەرەب بەسـەر گەلانی تریـان پیـادە کـرد، کـە زۆر بـە ئاشـکرایی لـە دژی بنەماکانـی خـودی ئیسـلامیش بـوون، ودەسـتیان کـردە سـەپاندنی ئـەو بیروباوەڕانـە لـە نـاو تیـۆری سـەلەفییەت بێئـەوەی سـەنەدێکی بـە هێزیـان هەبێـت لـە قورئـان وحەدیسـدا. ڕاسـتە حەدیسـێکی زۆریـان دۆزیبـوەوە لەسـەر توخـم بالایی عـەرەب، بـەڵام ئایـەت و حـەدیسی بەهێزتـر هەبـوون کـە پێچەوانـەی ئـەو بـاوەڕە بـوون، کەچـی ئـەوان دەقـە دووەمینەکانیـان زاڵ کـرد بەسـەر یەکەمیـن و بەهێزتـرەکان، تـا ڕەگەزپەرسـتی عەرەبـی ئومـەوی بـەوە گەیشـتبوو، کـە هەتـا نەدەبـوو غەیـرە عەرەبێـک (مەوالـی بـە زاراوەی ئـەو ڕۆژگـارە) پێشـنوێژی بـۆ عـەرەب بکات!!
یـان نەدەبـوو غەیـرە عەرەبێـک ژنێکـی عـەرەب بهێنێت، چونکـە لـە مەخیلەتـی عەرەبـی ژن بـوون ووەزیفـەی ژنێتـی، یانـی ژێرچەپۆکـی و دیلێتـی و بەشـی ژێـرەوە و وئەوپـەڕی ئیهانـەت وسـوکایەتی، کەوابـوو چـۆن دەبێـت غەیـرە عەرەبێـک، بەسـەر ژنێکـی عـەرەب کەوێت؟!
عەقڵیەتی توراسی عەرەبی هەتا ناوی کردەی سێکسی نێوان ژن وپیاو، هەمووی بە سوکایەتی داتاشیوە بۆ ئافرەت.
لە ڕوانگەی عەرەبی مرۆڤ چۆن ڕەفتار دەکات لەگەڵ ئاژەڵەکانی، بە هەمان شێوە زاراوەکانی گواستۆتەوە بۆ چوارچێوە ئینسانیەکە و بەکاریان دەهێنێتەوە لەکاتی ڕەفتارکردنی لەگەڵ ژنیدا، هەتا وەسفی جوانی حوشتریشی وەک [الدلصاء، والضرعاء، و الدحدوح و القيدود، ئەوانە هەمووی بەژدارن لە نێوان حوشتری ناقە و ژن دا!
دەربارەی پەیوەندی سێکسی ژن وپیاویش هەمان بە ئاأەڵکردن وزاراوەی ئاژەڵی بۆ بەکار دەهێنێت وەک :[ امتطاء، الوطا، اعتلاء، درس، تحته امرأة، فرش امراته..] چەندیـن ناویتـر کـە وا نیشـان دەدات ئـەو کارەی لەگـەڵ خێزانـی خۆشـت دەکەیـت زۆر قێـزەون و شـورەییە بـۆ خێزانـت!
ئەگـەر سـەرنجی ئـەو موفرەداتانـەی سـەرەوە بدەیـن، کـە بـۆ کاری جـوت بـوون لـە عەرەبـی دا هاتـوە، دەزانیـن ژن وکاری جـووت بـوون چەنـد قێزەونـە، لـەو عەقڵیەتـە عەرەبیـەی سـەردەمی پێـش و پاشـی ئیسـلام دا، کـە توانـی بـۆ هەتایـە زاڵ بێـت

بەسـەر عەقڵیەتـی عەرەبـی و ئیسـلامیدا!
تـا ئێسـتاش ئـەو عەقڵیەتـە بوونـی هەیـە و عـەرەب و زۆربـەی گەلانـی موسـڵمان، کـە کەوتوونەتـە ژێـر کاریگـەری ئـەو عەقڵیەتـە عەرەبیـە دینییـە، ئەگـەر بیەوێـت سـزایەکی گـەورەت بـدات، دەسـت بـە جوێنـدان دەکات بـە ئافرەتەکانـی کـەس وکارت، یـان دەسـتدرێژی بـۆ ئافرەتەکانـت دەکات نمەنـەی ئـەو عەقڵیەتـە لـەو سـوکایەتیەی ڕژێمـی بەعسـی عەرەبـی عێراقـی ڕەنگـی دایـەوە، لـە دژی ئافرەتـی کـورد لـە ئەنفالـەکان وفرۆشـتنیان وەک کەنیـزەک لـە نـاوەوە ودەرەوەی عێـراق!
بێگومـان بەپێـی کتێبەکـەی ابـن تیمیـە (اقتضـاء الصـراط المسـتقيم) ،کـە سـانێک لەوانـەی پێیـان دەڵێـن سـەلەفی سـالح، لـە سـەحابە وتابعـی وئەئیمـەکان کەوتونەتـە داوای ئـەو عروبەتـەی ئومەوییـەکان، وەک لـەو بەشـە کتێبـەی بـە نـاوی (أعمـال الكفـار والأعاجـم ونحوهـم تنقسـم إلـى ثلاثـة أقسـام) هەتـا ڕیوایەتێکـی بـێ گومـان سـەیری داوەتـە پـاڵ خـودی پێغەمبـەر، گوایـە نەهـی کـردوە کەسـانێک ئەگـەر عەرەبـی بزانـن، بـە زمانێکـی عەجەمـی واتـە غەیـرە عەرەبـی قسـە بکـەن! چونکـە دەبێتـە هـۆی دروسـت بوونـی نیفـاق!! ڕیوایەتەکـە دەڵێـت:
(حدثنـا أسـامة بـن زيـد عـن نافـع عـن ابـن عمـر رضـي اللـه عنهمـا قـال: « قـال رسـول اللـه صلـى اللـه عليه وسـلم: مـن يحسـن أن يتكلـم بالعربية فلا يتكلـم بالعجمية فإنـه يـورث النفـاق (.
مـن نازانـم زمـان پەیوەنـدی چیـە بـە نیفـاق، هـەزاران کەسـی عەرەبـی نـەزان هـەن چاکتریـن موسـڵمانن، بـە پێـوەری ئیسـلام. لەکاتێکدا هەزارەهـا وملیۆنەهـا عەرەبـی زمـان هـەن، ئیسـلامیان خـۆش ناوێـت لـە دڵـی خۆیـان وکەچـی نیشانیشـی نـادەن، وسـەدان ملیـۆن عەرەبـی نەزانیـش وەک کـورد وئەفغانـی وهینـدی وپاکسـتانی وئەندەنوسـی وبەنگلادیشـی، حەرفێـک عەرەبـی نازانـن کەچـی بـە دڵسـۆزی پەیـڕەو لـە ئیسـلام دەکـەن ئامـادەن گیـان وماڵیشـیان ببەخشـن لـە پێناویـدا.
هەروەهـا چەندیـن ڕیوایەتـی لـە سـەحابەیەکی وەک عومـەر وعبداللـەی کـوڕی وسـعدی کـوڕی ئەبـو وەقـاس دەگێڕێتـەوە، کـە عەقـڵ پێـی هـەرس ناکرێـت ئـەو ڕەگەزپەرسـتیە، بـەو ئاسـتە نزمـە لەوانـە دەرچوبێـت، بـۆ نمونـە: (عـن عطـاء بـن يسـار قـال: قـال عمـر: إياكـم ورطانـة الأعاجـم، وأن تدخلـوا علـى المشـركين يـوم عيدهـم في كنائسـهم.) [نەکـەن بـە عەجەمـی بدوێـن، یـان بچنـە لای موشـریکەکان لـە پەرسـتگاکان وکلێسـەکانیان].
هـەر لـە ڕیوایەتێکـی تـردا گوایـە حەزرەتـی عومـەر وتویەتـی: (قـال عمـر: مـا تكلـم

الرجل بالفارسية إلا خب، ولا خب إلا نقصت مرؤته ) ئەوەی بە فارسی بدوێت فێری تەڵەکەچیەتی دەبێت، کە بو بەتەڵەکچیش مروئەتی کەم دەبێت!! کارەساتە ئەگەر ئەو ڕیوایەتانە درۆ وهەڵبەستراو نەبن، فارسی ئاخاوتن بۆچی مرۆڤ دەکاتە تەڵەکباز وبێ مرووەت؟!

ئەو قسانە نە لەو عەدالەتەی باسی دەکەن بۆ عومەر و نە لەو بلیمەتیەی عومەر ونە لەو تەقوایەی عومەر دەوەشێتەوە.

لە ڕیوایەتێکی تری عبداللەی کوڕی عومەر باسی نەورۆز دەکات، ودەڵێت ئەوەی لە وڵاتی عەجەمان بوو، وەک ئەوان ئاهەنگی نەورۆزی کرد، وتا لە ژیان بوو خۆی پێیان چواند، لەگەڵ ئەوان حەشر دەکرێت: (وبالإسناد عن الثوري، عن عوف عن الوليد -أو أبي الوليد - عن عبد الله بن عمر قال: من بنى ببلاد الأعاجم فصنع نيروزهم ومهرجانهم وتشبه بهم حتى يموت وهو كذلك - حشر معهم يوم القيامة).

بێگومان لەبەر نزیکی سەردەمی خەڵکی فارس بە ئیسلام بونیان، دەکرێت کوڕی عومەر ترسا بێت کە نەورۆز ڕەهەندێکی ئایینی هەبێت، کە لە ڕاستیدا نەورۆز هیچ بنەمایەکی ئاینی نییە، بەڵام دەکرێت عبداللەی کوڕی عومەر هەر هێندەی زانیبێت دەربارەی نەورۆز. نەبوونی زانیاری هەموو کاتێک وئەو کاتەش خەڵکی دڕدۆنگ دەکات لە یەکتر، وهانیان دەدات بەچاوی پڕ گومان وترسەوەبڕواننە یەکتر، کە لە سۆسیۆلۆژیا پێی دەڵێن زەنەفۆبیا Xenophobia .

سەیر لەوەدایە سەلەفیەکانی سەدەی ٢١ لە عەرەب وکورد، لەو ڕۆژگارە هەمان قسەکانی عبد اللە کوڕی عومەر دوبارە دەکەنەوە، بێ ئەوە هیچ بیانوێکیان هەبێت، تەنها دواکەوتنی کوێرانە ونا عەقڵانیەتیانە بە شوێن سەلەفی ساڵح، لە ورد ودرشت وچاک وخراپ وڕاست وچەوتیاندا.! خۆزگە لەوەشدا سەلەفی کورد خاوەنی ڕاو بیری خۆی با، نەک کوێرانە بێت ووتاری سەلەفیەکی عەرب لەسەر حەڕامکردنی نەورۆز وەرگێڕێتە سەر کوردی وبە خەڵکی بفرۆشێتەوە، لەو بارەیە دوو سێ وتارمان نوسیوە بۆ ئەوەی دەیەوێت بگەڕێتەوە سەری.

هەر لەو کتێبەی ابن تیمیەدا دەڵێت سعدی کوڕی ئەبو وەقاس گوێی لە کەسانێک بوە بە فارسی قسەیان کردوە، پێیانی وتوە: ئەو مەجوسیەتە لە پای چی لە پاش دینی حەنیفیەت (واتە ئیسلام) (حدثنا إسماعيل بن علية، عن داود بن أبي هند أن محمد بن سعد بن أبي وقاص سمع قوماً يتكلمون بالفارسية فقال: ما بال المجوسية بعد الحنيفية.) کەوابوو تەنها قسەکردن بە فارسی، هاوتای

مومارەسەکردنی دینی مەجوسیەت بوە لە عەقڵیەتی سەعددا! کێ ناڵێت هەر باس باسی ئیسلام بوە، بەلام بۆ عەرەبی نەزانێکی فارس، بە زمانی خۆی بۆی ڕونکراوەتەوە!!

من بە دوری نازانم ئەو هەموو ڕیوایەتانە لە کارخانەکانی ئومەویەکاندا بەرهەم هاتبێت. هەر لەو بارەیەوە چەندین ڕیوایەتی تر لە تابعیەکاندا دەگێڕێتەوە، کە هەمووی ئەو پەڕی ڕەگەزپەرستی پێوە دیارە، بۆ نموونە موجاهید رقی لەناو نانی مانگەکان بۆتەوە بە فارسی، نەک هێندە، بەڵکو رقی لەوەش بوە کە هەتا یەکێک ناویشی فارسی بێت بەناوێکی فارسی بانگی بکات!!

(وروى فيه عن مجاهد حديثاً أنه كره أن يقال: آذرماه، وذي ماه قلت: فإن كان اسم رجل أسميه به ؟ فكرهه)

ابن موبارەک ڕقی لەو وشەی (یەزدان) یش بوە، کە بە خوا دەگوترێت بە فارسی، لە ترسی ئەوەی ئیزافە کرابێت بۆ شتێکی پەرستراو! دەکرا پرسیاری کردبا لە ماناکەی، بەر لەوەی ڕقی لە ناوی خوا بێتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی بە فارسی هاتوە! وادەزانن خواش عەرەب بووە، ناویشی هەردەبێت بە عەرەبی بهێنرێت! (قال: وكان ابن المبارك يكره ايزدان يحلف به، وقال: لا آمن أن يكون أضيف إلى شيء يعبد)

ئەو هەڵوێستانە هەمووی یان زۆربەی، لە بێ ئاگایی وترس و گرێی زەنەفۆبیا و نەبوونی زانیاریەوە هاتوە، یەکیان نازانێ نەورۆز چیە، ئەویتریان نازانێت یەزدان مانای چیە ترسی هەیە ئیزافە کرابێت بۆ شتێکی پەرستراو!

هەروەها ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وەسفی زمانی فارسی دەکات بە زمانی خراپ، کە ناشێ سویندی پێ بخورێ، یان نوێژ وهەموو عیبادەتەکانی تری پێ بکرێت!

وقد سُئل الإمام أحمد بن حنبل عن الدعاء في الصلاة بالفارسية؟ فكرهه. وقال: لسان سوء ولا يصح الحلف بها ولا الصلاة ولا سائر العبادات اقتضاء الصراط المستقيم، ص ٢٠٤.

ئەوە لەو کاتەدا فارسی یەکێک بوو لە گرنگترین زمانی جیهانی ئەوسا، عەرەب بە هەزاران کتێبی ودەستنوسی فارسیان وەردەگێرا لە بەرهەمی ژیاری فارسیدا، ئەو زمانەی کە ئەوسا و تا ئێستاش گرنگی خۆی لە دەست نەداوە:

هەروەها مالیک بن ئەنەس بارەکە گرژتر وقوڕەکە خەستتر دەکات، وکەیسەکە نزیک دەکاتەوە لە ڕەگەزپەرستیەکی ڕاشکاو کاتێ دەڵێت: ئەوەی لە مزگەوتەکانمان بە غەیری عەرەبی دوا وەدەردەنرێت!!

وەک ابن تەیمیە لە مجموع الفتاوی دەگێڕێتەوە: سەلەف زۆریان پێ ناخۆش بوو داب و نەریتی عەرەب بگۆڕدرێت هەتا لە موعامەلاتیشدا وەک [قسە نەکردن بە غەیری عەرەبی تەنها بۆ پێویستی نەبێت، وەک لە مالک و شافیعی و ئەحمەد دا هاتووە، بەڵکو مالیک دەڵێت: ئەوەی لە مزگەوتەکانمان بە غەیری عەرەبی دوا وەدەردەنرێت!!

« وَمَا زَالَ السَّلفُ يَكْرَهُونَ تَغْيِيرَ شَعَائِرِ الْعَرَبِ حَتّى فِي الْمُعَامَلَاتِ وَهُوَ « التَّكلُّم بِغَيْرِ الْعَرَبِيّة « إلّا لِحَاجَةِ كَمَا نَصّ عَلَى ذَلِكَ مَالِك وَالشّافِعِيُّ وَأَحْمَد بَلْ قَالَ مَالِك: مَنْ تَكَلَّم فِي مَسْجِدِنَا بِغَيْرِ الْعَرَبِيّة أُخْرِجَ مِنْهُ. مجموع الفتاوی (٣٢ / ٢٥٥)

ئەو جۆرە بیرکردنەوە بوە هۆی کاردانەوەیەکی توند لەلایەن گەلانی غەیرە عەرەب، و ڕەوتێکی پێچەوانە دروست بوو بە ناوی بزوتنەوەی (اهل التسویە) یان ئەوەی عەرەب ناوی نان بزوتنەوەی شعوبیەت، واتە گەلچییەکان.

ابن تیمیە دان بەوەدا دەنێت، کە ئەو جۆرە سیاسەتە عەرەبیە، بۆتە هۆی بە عەرەبکردنی زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی ئەو وڵاتانەی کە هاتنە ناو ئیسلامەوە، لەوبارەیەوە دەڵێت:

"وأما اعتياد الخطاب بغير اللغة العربية، التي هي شعار الإسلام ولغة القرآن حتى يصير ذلک عادة للمصر وأهله، أو لأهل الدار، للرجل مع صاحبه، أو لأهل السوق، أو للأمراء، أو لأهل الديوان، أو لأهل الفقه، فلا ريب أن هذا مكروه فإنه من التشبه بالأعاجم، وهو مكروه كما تقدم، ولهذا كان المسلمون المتقدمون لما سكنوا أرض الشام ومصر، وأهلهما رومية، وأرض العراق وخراسان ولغة أهلهما فارسية، وأهل المغرب، ولغة أهلها بربرية - عودوا أهل هذه البلاد العربية، حتى غلبت على أهل هذه الأمصار: مسلمهم وكافرهم...» اقتضاء الصراط المستقيم، ص ٢٠٦.

(لێڕاهاتنی ئاخاوتن بە غەیری زمانی عەرەبی، کە دروشمی ئیسلامە وزمانی قورئانە، تا ئەو کاتەی دەبێتە زمانی ئەو شارە وخەڵکەکەی، وزمانی ئاخاوتنی ماڵەوە ونێوان هاوڕێیان، وزمانی خەڵکی بازاڕەکان، وفەرمانڕەواکان، ودیوانەکان (فەرمانگەکان) وئەهلی فیقە، گومانی تێدا نیە کە مەکروهە وەک باسکرا، بۆیە موسڵمانەکانی بەرایی، کاتێک لە خاکی شام ومیسر نیشتەجێ بوون، کە خەڵکەکەی ڕۆمی بوون، ولە عێراق وخوراسانیش کە زمانی خەڵکەکەی فارسی بوو، ولە مەغریب کە زمانی خەڵکەکەی بەربەری بوو، خەڵکی ئەو وڵاتانەیان لەسەر ئاخاوتنی عەرەبی ڕاهێنا، هەتا عەرەبی زاڵ بوو بەسەر زمانی موسڵمان وکافرەکانیان)

ئیبن تەیمیە زۆر لە خۆی دەكات تا بە ناچاری دەڵێت: « جایزە بە زمانی تر بدوێی، بەڵام سەلەف تەنها ڕێگایان پێدا بۆ پێویستی، وپێیان خراپە لە كاتی نا پێویستیدا بۆ پاراستنی شەعیرەكانی ئیسلام، چونكە خوا كتیبەكەی بە عەرەبی دابەزاندوە، بۆ پێغەمبەرە عەرەبەكەی ونەتەوەی عەرەبیشی بە چاكترین نەتەوە دانا، بۆیە پاراستنی ئەو دروشمانەیی عەرەب لە كرۆكی پاراستنی ئیسلام دایە."
مَعَ أَنّ سَائِرَ الْأَلْسُنِ يَجُوزُ النُّطْقُ بِهَا لِأَصْحَابِهَا؛ وَلَكِنْ سَوَّغوهَا لِلْحَاجَةِ وَكَرِهُوهَا لِغَيْرِ الْحَاجَةِ وَلِحِفْظِ شَعَائِرِ الْإِسْلَامِ؛ فَإِنّ اللهَ أَنْزَلَ كِتَابَهُ بِاللِّسَانِ الْعَرَبِيِّ وَبَعَثَ بِهِ نَبِيُّه الْعَرَبِيّ وَجَعَلَ الْأُمَّةَ الْعَرَبِيَّةَ خَيْرَ الْأُمَمِ فَصَارَ حِفْظُ شِعَارِهِمْ مِنْ تَمَامِ حِفْظِ الْإِسْلَامِ»
مجموع الفتاوى (٣٢ / ٢٥٥)
ئینجا پاش كاردانەوەی گەلان بۆ ئەو سیاسەتە تەعریبە و ڕەگەزپەرستیەی ئومەویەكان، خەڵكی بەرگری تەعریبكردنیان كرد، ودەستیان بە زمانی خۆیانەوە گرت، هەرچەندە زۆربەیان ئیسلامیشیان قبوڵ كرد، تا عەرەبە فاتیحە نوێكانیان ناچاركردن بەزمانی ناعەرەبی خۆیان بدوێن لەناو وڵاتەكانیان، حاڵەكە بەوە گەیشت كە ابن تیمیە وا باسی دەكات:
"ثم إنهم تساهلوا في أمر اللغة، واعتادوا الخطاب بالفارسية، حتى غلبت عليهم، وصارت العربية مهجورة عند كثير منهم، ولا ريب أن هذا مكروه، إنما الطريق الحسن اعتياد الخطاب بالعربية، حتى يتلقنها الصغار في المكاتب وفي الدور فيظهر شعار الإسلام وأهله، ويكون ذلك أسهل على أهل الإسلام في فقه معاني الكتاب والسنة وكلام السلف»
(ئینجا خەمساردیان كرد لە بابەتی زمان، وفێری ئاخاوتن بوون بە فارسی، تا زاڵ بوو بەسەریان. زمانی عەرەبی لەلایەن كەسانێكی زۆر وازی لێهێنرا، ئەوەش بێگومان مەكروهە، چونكە ڕێگای ڕاست و چاك ڕاهاتنە لەسەر ئاخاوتن بەعەرەبی، هەتا منداڵان لە حوجرەكانیش فێری دەبن بۆ نیشاندانی دروشمی ئیسلام وخەڵكەكەی، ئەوەش ئاسانترە بۆ موسڵمانان بۆ تێگەیشتن لە مانای قورئان وسونەت وقسەی سەلەفی سالح)
سەیر لەوەدایە لەناونێوەندی رۆشنبیری كوردی ئاینی واباوە كە ابن تیمیە كوردە!! كەچی لە نوسینەكانی بەدیار دەكەوێت زۆر لە ئومەویەكان ڕەگەزپەرستر وعروبی تر بووە، چونكە ابن تیمیە مەسەلەكە دەخاتە قاڵبێكی عەقیدیەوە، وپڕ بەدەم لە (اقتضاء الصراط المستقيم) دەڵێت: (فأن الذي عليه اهل السنة والجماعة اعتقاد ان جنس العرب افضل من جنس العجم، عبرانيهم وسريانيهم ورومهم

وفرسـهم وغيرهـم..) مجمـوع الفتـاوى (٢٩/١٩-٣٠)
من نازانـم ئیبـن تەیمیە ئـەو قەولـەی لـە کویێ هێنـاوە لـە کاتێکدا قورئان بە ڕاشـکاوی دەڵێت: (ان اکرمکم عند اللـه اتقاکم) وحەدیسـی سـەریحی پێغەمبـەر [د.خ] هەیـە دەڵێ [لافـرق بيـن عربي واعجمـي الا بالتقـوى] وچەندیـن دەقـی تـر، ئـەو هەڵەیـە دەکرێت چاوەڕوان کراو بێت بۆ میشـێل عەفلەق وشـبل العیسـمي وەک دوو تیۆریسـتی حزبی بەعس و ئایدیۆلۆژیای قەومـی عەرەبی، بەڵام بۆ فەرمودەناسـێک و شـەرعناسـێک و شـێخی ئیسـلامێکی وەک ابن تیمیە هیچ عوزرێکی بۆ نییە!!
یـان زمانـی عەرەبـی وەک روکنێکـی ئیسـلام دادەنێـت کـە دەڵێـت: زمانـی عەرەبـی شـیعاری ئیسـلامە، دروسـت نییـە موسـڵمان بـە غەیـری عەرەبـی بـدوێ" !!!
"فإن اللسـان العربي شـعار الإسـلام وأهلـه، ولا يصـح لمسـلم التكلـم بغيـره...» اقتضاء الصراط المستقيم ص٢٠٣
ئینجـا ابـن تیمیـە سـەدان ئەقـوال دەگوازێتـەوە، لـە ئیمامەکانـی ئەهلـی سـونە بـۆ سـەلماندنی ئـەو مەقولەیـەی، کـە ڕەگـەزی عـەرەب لـە هەمـوو ڕەگەزەکانـی تـر چاکتـرە، وکـە لـە ئەنجامـدا دەگاتـە ئـەو ڕایـەی کـە زمانـی عەرەبیـش لـە هەمـوو زمانەکانـی تـر چاکتـرە.
ئـەو بیرۆکەیـەی کـە زۆر ئاشـکرا پێچەوانـەی قورئـان دەکات، لای ئیبـن تەیمیـە دەبێتـە ئەسـڵێک لـە ئسـوڵەکانی ئەهلـی سـونە وجەماعـەت. سـەیر لەوەدایـە کـە ابـن تیمیـەی شـارەزا لـە قورئـان ومەوسـوعە لـە فەرمودەزانـی، چـۆن ئـەو بیرۆکـە ڕەگەزپەرستییەی بەسـەردا تێدەپەڕێت ووا بـە ئاسـانی؟! چـۆن پشـت بـەو فەرمودانە دەبەسـتێت و بـە بەڵگـە دەیـان هێنێتـەوە، کـە بچوکترین موحەدیس دەزانێت سـەحیح نیـن یـان هـەر هەڵبەسـتراون! بـۆ چـاوی وا تیـژە بـۆ شـیعە وسـۆفیەکان و ئـەوەی ئـەو ناویـان دەنێـت بیدعەچیـەکان، کەچـی وا بـێ نـەزەرە لـە ئاسـت ئـەو فەرمـودە هەڵبەسـتراوانەی عروبەتـی ئومەویـەت؟!
وەلامەکـەی دەیسـەلمێنێت کـە ئـەو سـەلەفییەتە پیشەسـازیەکی ئومەوییـە، ولەبـەر ئامانجـی عەرەبچیەتـی، ئومەوییەکانیـش ئاینەکەیـان لـە ڕێگای ئـەو تیـۆرە سـەلەفیە سـەقەتانە، بـەرەو ڕەگـەز پەرسـتی هەنگاویـان پێـی نـاوە، بـە نـاوی دیـن وسـەلەفی سـالح.
هـەر ئـەو بیرۆکەیەشـە بۆتـە هـۆی فریودانـی ژمارەیەکـی زۆری کـوردی سـەلەفی وهەتـا غەیـری سـەلەفیش، بـۆ وازهێنـان لـە زمانـی زگماکـی خۆیـان. وقسـەکردن لەگـەڵ مناڵەکانیـان بـە عەرەبی!! من خـۆم لـەو لەندەنـە کوردێکـی سـەلەفی شـاریکی

كوردپەروەر وەک سلێمانی دەناسم، هێندە دەبەنگە هەتا عەرەبیەكەی باشیش نیە، كەچی لەگەڵ منداڵەكانی بە عەرەبی قسە دەكات، ولەسەر خێزان وكەسوكاریشی سەپاندوە، كە دەبێت لەگەڵ منداڵەكانی بە عەرەبی قسە بكەن! ویەكێک لە منداڵەكانیشی كردۆتە جاسوس بەسەر دایكی تا بە كوردی لەگەڵ منداڵانی قسە نەكات.!!

ئەوە لە كاتێدا پێغەمبەر بە زمانی حەبەشی قسەی لەگەڵ منداڵێک كردوە كە جلێكی جوانی لەبەردا بوە پێی گوتوە: هذا سنا، واتە ئەوە جوانە.

لەوەش ترسناكتر مەیلێكی ترهەیە بۆ تەعریب كردنێكی تۆبزی بەبێ ئەوەی لێشت بپرسن كە تۆ ڕات چیە لەو بارەیەوە، دەڵێن ئەوەی بە موسڵمان لە دایک بوو عەرەبە:

"روى الحافظ أبو طاهر السلفي – في فضل العرب – بإسناده عن أبي شهاب الحناط حدثنا حبان بن موسى، عن أبي جعفر محمد بن علي بن الحسين بن علي قال: « من ولد في الإسلام فهو عربي «. اقتضاء الصراط المستقيم/ ٤٠٨

بە پێی ئەو چەمكە عروبەت پەیوەندی بە خوێن ونەسەب نیە بەڵكو زمانە، هەركەسەی بە عەرەبی دوا ئەوە عەرەبە، حەدیسێک لە پێغەمبەر دەگێڕنەوە كە لە چەندین سەرچاوە بە لاواز وزەعیف دەستنیشان كراوە دەڵێت: خوا یەكە، باوک یەكە، دینیش یەكە، عەرەبی بوون بە دایک وباوک نییە، بەڵكو بە زمانە، ئەوەی بە عەرەبی قسەی كرد عەرەبە!

عن مالك بن أنس، عن الزهري، عن أبي سلمة بن عبد الرحمن قال: ..... فقام النبي صلى الله عليه وسلم ...ثم نودي: أن الصلاة جامعة، فصعد المنبر، فحمد الله وأثنى عليه ثم قال: « أما بعد: أيها الناس، فإن الرب رب واحد، والأب أب واحد، والدين دين واحد، وإن العربية ليست لأحدكم بأب ولا أم، إنما هي لسان، فمن تكلم بالعربية فهو عربي "

ابن تیمیە لە كۆمێنتی خۆیدا دەڵێت حەدیسەكە زەعیفە، بەس هەر دەستی لێ بەرنابێت و دەڵێت لە هەندێ ڕووەوە ڕاستە! ئەوە دەقی قسەكەیەتی: ئەوە حەدیسێكی لاوازە بۆ مالیک هەڵبەستراوە، بەڵام لە ڕووی مانادا دوور نیە، بەڵكو ڕاستە لە هەندێ ڕووەوە!!

" ذا الحديث ضعيف، وكأنه مركب على مالك لكن معناه ليس ببعيد، بل هو صحيح من بعض الوجوه « اقتضاء الصراط المستقيم ٤١٠

بەڵێ دوور نیە لە چەمكی عروبەتی ئومەوی بە بڕوای ئیبن تەیمیە، بەڵام دەبوایە

شێخی ئیسلام بیزانیبایە کە دورە لە چەمکی قورئان وفەرمودە ڕاستەکان!
ئەوەش چەمکی سەرەکی ئومەویەکان بوو، بۆ تەعریب کردنێکی پەردەپۆش کراو بە دین، کە لەبەر ساویلکەیی ئایینی و هوشیاری ژیاری، لە ڕێگای ئەو چەمک وتێگەیشتانەدا توانرا زۆر لە میللەتان بە ئاسانی بتوێنەوە لە ناو عروبەت، وئەمڕۆ بونەتە رەسید و پاڵپشت بۆ عروبەت نەک بۆ ئیسلام!
دەگێڕنەوە لە حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، کە وەلائی بۆ ئومەویەکان بە هێزتر بوو، لە وەلائی بۆ خودی ئیسلام ،ولە هیچ پیرۆزیەکی ئیسلام دەستی نەدەپاراست لە پێناو ڕازیکردنی ئومەویەکان، کە هاتە عێراق بە خەڵکەکەی گوت: تەنها عەرەب دەبێ ئیمامەتی نوێژتان بۆ بکات، خەڵکەکەش هەڵیان کوتایە سەر یەحیای کوڕی وەساب بۆ وەلانانی، کە ئەو کارە بە حەجاج گەیشتەوە گوتی: هەی لەناوچن من گوتم عەرەبی زمان، بەڵام یەحیای کوڕی وەساب هیچی تر ڕازی نەبوو پێشنوێژیان بۆ بکات.!! تۆ ئەو چەمکە ڕەگەزپەرستییە بڵاوکەیتەوە، هەر ئەوە ئەنجام و دەنگدانەوەی دەبیت لەناو خەڵکی گشتیدا.
لما قدم الحجاج قال:لا يؤمنكم إلا عربي، فوثبوا بابن وثاب وقالوا: نعزله عن الإمامة، فبلغ الحجاج ذلک فقال: ويحكم إنما قلت عربي اللسان. فأبى ابن وثاب أن يصلي بهم.» أنساب الأشراف للبلاذري [١١ / ٢٠٠]
هەر لەو کارخانەیەی ئومەویەکاندا دەیان فەرمودەی هەڵبەستراو بە دەمی پیغەمبەر دەرچوو کە هەموویان دەستنیشان کراون بە حەدیسی هەڵبەستراو ومەوزوع، کەچی ئامادەییەکی زەقی هەیە لە کۆی عەقڵیەتی ئیسلامیدا، لە جۆری: عەرەبتان خۆش بوێ لەبەر سێ هۆ: چونکە من عەرەبم، قورئان عەرەبیە، وزمانی بەهەشتیش عەرەبیە! [أحبوا العرب لثلاث لأني عربي، والقرآن عربي، وكلام أهل الجنة عربي]
حەزتان بە مانەوەی عەرەب بێت، مانەوەیان نور و ڕوناکیە بۆ ئیسلام، و لەناوچونیانیش لەناوچوونی ئیسلامە. [أحبوا العرب وبقاءهم، فإن بقاءهم نور الإسلام وإن فناءهم فناء الإسلام]
ئەگەر عەرەب زەلیل بوو، ئیسلام زەلیل دەبێت [إذا ذل العرب ذل الإسلام]. کەس ڕقی لە عەرەب نابێتەوە ئەگەر مونافیق ودوو ڕوو نەبیت [لا يبغض العرب إلا منافق]. خۆشەویستی عەرەب لە باوەردایە، وڕقیشیان لە نیفاقەوەیە. [حب العرب إيمان وبغضهم نفاق]. ئیماندار ڕقی لە عەرەب نابێتەوە [لا يبغض العرب مؤمن] من گومانم نییە لە هەڵبەستراوی ئەو حەدیسانە، کە بلیمەتێکی فەرمودەناسی

وەک ابن تیمیە چاویان لێ ئەنوقێنێ، ولەجیاتی بلێت هەڵبەستراون بە بەڵگە دەیان هێنێتەوە، بۆ سەلماندنی چەمکی عروبەتی ئومەوی. بەڵام پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین، کە ئەو ئەو جۆرە فەرموودانەیە زۆر لە لێکۆڵێنەرانی گەیاندووە بەو قەناعەتەی، کە ئیسلام لە بنەڕەتدا پرۆژەیەکی عەرەبی بووە، بۆ ڕابوونی قورەیش وەک کرۆکی عەرەب و عروبەت، هاتۆتە کایەوە! چونکە وەک دەبینیت خێری ئیسلامیش هەر لە سەرەتاوە بۆ قورەیش بە پلە ئەک و ئینجا عەرەب بوو زیاتر بۆ نەتەوەکانی تر.
سەردەمی فتوحات هەموو خێری ئیسلام و تالان و غەنیمە و کۆیلە وجاریەی دەنێردرایەوە جەزیرەی عەرەبی! ئێستاش سالانە ملیارات دۆلار دەبردرێت بۆ حەج، کە خێرەکەی هەر بۆ عەرەب و جەزیرەی عەرەبییە! سەرەڕای ئەوەی لە ڕێگای ئەو ئیسلامەدا ملیۆنەها خەڵکی ناعەرەبی میسر وسوریا و سودان و سۆماڵ و لیبیا و جەزائیر ومەغریب و تونس و مۆریتانیا تەعریب کران! کەوابوو ناهەقیان نییە وا لێی تێبگەن! هۆکارێکیتریشی دەرکەوتنی ئەو فەرمودە هەڵبەستراوانە، لە ئەنجامی کاردانەوەی توخمە نا عەرەبیەکانەوە هاتوە لە دژی سیاسەتی ڕەگەزپەرستی وتەعریبی ئومەوی، کە لەوە دەچێت خەڵکی ناعەرەب وەک کاردانەوەیەک ڕقیان لە عەرەب بۆتەوە، کە لەوانەیە لەو کاتە ناهەقیان نەبوبێت، بەڵام کە ئێمە ئەو باسە دەکەین، هەرگیز هانی خەڵک نادەین کە ڕقیان لە عەرەب بێتەوە، وەک ئەو ڕقە مێژووییەی ئێرانیەکان وفارسەکان بە تایبەتی، بەڵام بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵکی کوردە کە ئیسلامبوون هیچ مانای بە عەرەب بوون ناگەیەنێت، ونابێت ئەو هەموو کارەساتە مێژوویانە وا بە ئاسانی لە بیر کەین ووانە وپەندیان لێ وەرنەگرین.

تشرینی یەکەم ٢٠٠٨

بەشی چوارەم

# محمدی کوڕی عبدالوهاب
# لە ستایشی کافرانەوە بۆ تەکفیری موسڵمانان
# ستایشی بێ باوەڕان
# شـیرکی کۆنـەکان زۆر چاکـتر لـە شـیرکی موسـڵمانانی ئەمـڕۆ!
# بە کۆیلەکردنی ئافرەت لەلایەن وەهابییەتەوە

# محمدی کوڕی عبدالوهاب

## له ستایشی کافرانەوە بۆ تەکفیری موسڵمانان

محمـدی کـوڕی عبـد الوهـاب لـه زۆر ڕوەوە، لـه ڕابەرانـی سـەلەفییەتی بەرایـی توندڕەوتـر ووشـکتر وترسـناکتر بـوو. هـۆکاری ئـەوەش دەگەڕێتـەوە بـۆ چەندیـن هـۆی جیا، لـه نێو ئەوانـه ئەگـەر ئەحمـەدی کـوڕی حەنبـەل وئیبـن التیمیه شارسـتان بـوون، نزیکتـر بـوون لـه ژینگـەی ژیـاری ئیسـلامی، ودیتـن وتێکەڵبـوون لەگـەڵ جۆرەهـا میللـەت وئـۆل وئایـن!

بـەڵام محمـدی کـوڕی عبـد الوهـاب بەدوێکـی (دەوارنشـینێکی) بیابـان بـوو، سـەرەڕای تەبەنـا کردنـی فیقهـی حەنبەلـی، هەمـوو میزاجـی بـەدەوی ووشـکی بیابـان نشـینینیشـی خسـته سـەر ئـەو توراسـه توند وتیژەی کـه تەبەنـای کـرد بـوو.

کـه شـەڕەکانی سـوپای وەهابیـەت، کـه ناسـراو بـوون بـه ئیخوانـه وەهابیـەکان دەخوێنیتـەوە، هەسـت دەکەیـت لـه شـێوازی شـەڕ ونەهـب وتـاڵان وبڕۆیـان، تەنهـا سـوپایەکی بـەدەوی دڵ ڕەق وبـێ ویـژدان زیاتـر نیـن، و تەنهـا لـه خەمـی غەنیمـەت وبـه چنـگ کەوتنـی زۆرتریـن بـڕی تاڵانـی زیاتـر، خەمـی هیـچ شـتێکیتریان نەبـوە.!

مێژوو نوسـی دەوڵەتـی سـعودیەی یەکـەم، عوسـمانی کـوڕی بشـری نەجدی، دانەری کتێبـی «عنـوان المجـد فـی تاریـخ نجـد» دەگێڕێتـەوە: چـۆن لەشـکری وەهابـی بـه سـەرکردایەتی ئیبـن سـعود، قەسـابخانەیەکی گەورەیـان لـه کەربـەلا کرد سـاڵی ١٨٠١، وزۆر بـه شـانازیەوە باسـی دەکات ودەڵێـت: " أخذنـا کربـلاء وذبحنـا أهلهـا وأخذنـا أهلها فالحمد لله رب العالمین ولا نعتذر عن ذلک ونقول: وللکافرین أمثالها".

(کەربەلامـان گـرت، وخەڵکەکەیمـان کوشـت، وتاڵانیشـمان کـردن. حەمـد وسـەنا بـۆ خـوا، وعوزریش بـۆ ئـەو کاره ناهێنینـەوە وپەشـیمان نیـن لـێی، ودەڵێیـن: کافرەکانـی تریـش هەمـان چارەنوسـیان دەبێـت)

هـەر لـەو بارەیـەوە ولـه هەمـان کتێبـدا دەڵێـت: " وقصـد أرض کربـلاء( مەبەسـتی سـعود بـن عبـد العزیـز بـن محمـد بـن سـعود )ه، وذلـک فـی ذی القعـدة، فحشـد علیها المسـلمون وتسـوروا جدرانها ودخلوها عنوة وقتلوا غالب أهلها فی الأسـواق

والبيوت.... وأخذوا جميع ما وجدوا في البلد من أنواع الأموال والسلاح واللباس والفرش والذهب والفضة والمصاحف الثمينة، وغير ذلك مما يعجز عنه الحصر .“
(سعودی كوڕی عبد العزيز كوڕی سعود بەرەو كەربەلا بەڕێكەوت لە مانگی زيلقەعدە، موسڵمانانی كۆكردەوە، وبەسەر شوراكانی شار سەركەوتن، وبە زۆرەملێيی چونە ناوی، وزۆربەی خەڵكەكەی ناو بازاڕ وماڵەكانيان كوشت... ئەوەی دەستيان كەوت و تاڵانيان كرد، لە سامان وماڵ وچەك وپۆشاك وڕايەخ وزێڕ وزيو وقورئانی گرانبەها، لە ژماردن نايەن)
هەر هەمان نوسەر لە مەلحەمەيەكی تردا، كە قوربانيەكانی ئەعرابەكانی بەنی خاليد بوو وخەريكی ئاودانی ئاژەڵەكانيان بوون لە ساڵی ١٢٠٧ كۆچيدا دەڵێت:
” فنهض عليهم المسلمون فرسانا وركبانا فلم يثبتوا لهم ساعة واحدة، فانهزم بنو خالد .. فتبعهم المسلمون في ساقتهم يقتلون ويغنمون، واستأصلوا تلك الجموع قتلا ونهبا“
(موسڵمانان بە سوار وپيادە هەڵمەتيان بۆ بردن، نەيانتوانی بۆ سەعاتێكيش بەرگری بكەن! بەنی خاليد دۆڕان... موسڵمانانيش – سەرنجی بەكارهێنانی ئەو موسڵمانانە بدە – بەدوايانەوە بوون دەيانكوشتن ودەسكەوتەكانيان كۆدەكردەوە، ئەو خەڵكانەيان ڕيشە كێش كرد بە كوشتن وبەتاڵان)!!
هەندێك نوسەری عەرەب پێيان وايە، لەبەر ئەوەی وەهابيەت و محمدی كوڕی عبد الوهاب لە (نەجد) سەريهەڵدا، نەجديش زانراوە كە مەڵبەندی ئەعراب ودەوارنشينەكانە، هەردەم دوژمنی مێژوويی (حيجاز) و قورەيش بوە، چونكە ئەعرابەكان سەر بە (ڕەبيعە) بوونە وقورەيشيش سەر بە (مضر) بوە، هەردەم ئەو دوو لايەنە لە كێشمە كێش بوونە! ئەو كێشەيەی نيوانيان لە چەندين فۆرمدا خۆی دوبارە كردۆتەوە، ولەو كێشانەدا هەردەم قورەيشيش سەركەوتو وبالادەست بوە، هەر ئەو دەوڵەتی ئومەوی وعەباسی وفاتيمی دروست كردوە، وەهەتا هەموو خەليفە ڕاشيدينەكانيش لە قوڕەيش بوون، بەڵكو تا بەر لە سەرهەڵدانی وەهابيەت، جەزيرە هەر لەژێر حوكمی ئەشرافەكانی قورەيش بوە! كاردانەوەی ئەعرابەكانيش لە زۆر شێوەدا خۆی نواندوە، سەردەمانێك لە شێوەی شەڕی هەڵگەڕاوەكاندا، وسەردەمانێكی تر، لە شێوەی جولانەوەی شوڕشگێڕی، وهەر بەناوی ئيسلام وەك خەواريجەكان ووەك بزوتنەوەی زينج وقەرامیتەكان، يان لە شێوەی تالان وبڕۆی كاروانی حاجيەكان... دوا گێمی ياريەكە ئەعرابەكانی

نەجد سەرکەوتنیان بەسەر قورەیشەکانی حیجاز تۆمار کرد، بە سەرکردایەتی محمدی کوڕی عبد الوهاب وئەمیری خانەوادەی ئالی سعود.
نەجدیش وەک زانراوە، خاوەن ژینگە وکەش وهەوایەکی وشک وهەژارە، ودابڕاوە لە جیهان، وخەڵکەکەی لە خۆیان زیاتر کەسیتریان نەدەدیت، وهەر غەریبێکیشیان بینیبایە، ئەوە وەک نێچیرێکی تاڵان وڕوتکردنەوە سەیریان کردوە.
ئەوەش سروشتی هەموو خێڵ و قەبیلە دابڕاوەکانە
ئەعراب وبەدوەکان بەر لە ئیسلامەوە تا ئەمڕۆش، گیانی تاڵان وفەرهود وسەلب ونەهب لە خوێنیان دەسوڕێتەوە، تا ئەمڕۆش ئەو ڕوحیەتە زاڵە بەسەر عەرەب بە شێوەیەکی گشتی، هەر بۆیەش هیچ داوەتێکی ئاینی وفیکری وئایدیۆلۆژی، نەیتوانیوە ئەو سروشتە تێکدەرە لە گیانی بەدوەکان ڕیشەکێش بکات! دەبوایە خەلافەتی ئیسلامی زۆر ئاگاداری ئەو ڕوحیەتە بوایە نەک ئەو خەڵکە بێ کۆنترۆڵە بخاتە پرۆسەیەکی دڕندانە و خەڵک بنێرێتە سەر خەڵک بەناوی بڵاوکردنەوەی ئایین. عەرەب بە دین و بێ دین خاوەن سروشتێکی تێکدەرانەن لە کاتی شەڕ وشۆڕدا، دەستیان بە هەر کوێ بگات وێرانی پێی دەگات، زۆر لە نووسەر و بیرمەندی عەرەبی ڕەخنەیان لەو پرۆسەی فتوحاتە گرتووە بە ناوی دین، هەتا دەڵێن عومەری کوڕی خەتاب، لە کۆتایی ژیانیدا پەشیمانی دەربڕیوە لەو فتوحاتانە کە ملیۆنەها تاوان و بێ ویژدانی تیادا ئەنجام درا! هەتا ابن الخلدون یش ئاماژەیەکی زۆر بۆ ئەو هەقیقەتەی گیانی تێکدەرانە دەکات، کاتێک ناونیشانی بەشی ٢٦ ی کتێبی (المقدمە) بەو شێوەیە دەست پێدەکات: " الفصل السادس والعشرون في أن العرب إذا تغلبوا على أوطان أسرع إليها الخراب» ... والسبب في ذلك أنهم أمة وحشية باستحكام عوائد التوحش وأسبابه فيهم فصار لهم خلقا وجبلة وكان عندهم ملذوذا لما فيه من الخروج عن ربقة الحكم وعدم الانقياد للسياسة وهذه الطبيعة منافية للعمران ...فطبيعتهم انتهاب ما في أيدي الناس وأن رزقهم في ظلال رماحهم وليس عندهم في أخذ أموال الناس حد ينتهون إليه بل كلما امتدت أعينهم إلى مال أو متاع أو ماعون انتهبوه فإذا تم اقتدارهم على ذلك بالتغلب والملك بطلت السياسة في حفظ أموال الناس وخرب العمران ..."

(واتە لەبارەی ئەوەی کە عەرەب دەستیان بەسەر هەر وڵاتێک داگرت، هەر زوو بە زوو وێرانی ڕووی تێدەکات) ... هۆکەشی ئەوەیە کە ئومەتێکی وەحشین وخوی تەوەحوش تیایاندا ڕەگی داکوتاوە, تا بۆتە ڕەوشت وسروشتیان، وئەو خوەش

لایـان شـیرینه, چونكـه ڕەهایـان دەكات لـه كۆتـی حوكـم ودوانەكەوتنـی سیاسـەتی هەڵسـوڕاندن، ئـەوەش سروشـتێكی پێچەوانـەی ئاوەدانییـه ... سروشـتیان بریتیـه لـه تاڵانكردنـی ئـەوەی لـه دەسـتی خەڵـك دایـه، ورزقیـان لەژێـر سـێبەری شمشـێرەكانیان دایـه، هیـچ سـنوریان نیـه لـه تاڵانكردنـی پـارە وسـامانی خەڵـك، بەڵكـو هـەر چاویـان بـه بـه سـامان وكـەل وپەلـی خەڵـك كـەوت تاڵانـی دەكـەن، ئەگـەر توانیـان زاڵ بـن بەسـەر شـوێنێك وفەرمانڕواییـان كـرد، ئـەوە سیاسـەتی پاراسـتنی مولـك وسـامانی خەڵـك نامینێـت، وئاوەدانـی وێـران دەبێـت!!!»

ئیسـتراتیژیەتی محمـدی كـوڕی عبـد الوهـاب وەك لـه ناونیشـانی ئـەو نوسـینه بەدیـار دەكەوێـت (لـه ستایشـی كافرانـەوە بـۆ تەكفیـری موسـڵمانان) لەسـەر ئـەو بنچینەیـه بنیـات نـراوە، واتـه لـه سـەرەتادا ستایشـی خەڵكـه بێباوەڕەكـەی سـەردەمی پەیامـی پێغەمبـەر (بـه كافـر ومونافیقەكانـەوە) دەكات، هەروەهـا ستایشـی یاوەرانـی موسـەیلەمەی  ناسـراو بـه [كەزاب] دەكات گوایـه ئـەوان (خواپەرسـت بـوون، حەجیان دەكـرد، خێـر وسـەدەقەیان دەكـرد، شـایەتیان دەدا كـه تەنهـا خـوا خالیقـه، وشـەریكی نیـه! وتەنهـا ئـەو ڕازیقە..وچەندیـن دەعـوای تـر كـه دوایـی بـه درێـژی باسـی دەكەیـن) ئەو هەمـوو ئارایشـتكردنەشـی لـه پێنـاو گەیشـتنه ئـەو ئەنجامـەی، كـه ئـەو تەنهـا دژی كەسـانێك جەنـگاوە كـه لـه بـێ بـروا و كافرەكانـی سـەردەمی پەیـام زۆر خراپتـر بـوون، بەڵكـو ئـەو كەسـانێكی كوشـتوە، لـه پایـه وفـەزڵ وچاكیـدا هەرگیـز شـان لـه شـانی [كافـران ومونافیقانـی] سـەردەمی دەركەوتنـی ئیسـلام نـادەن!!. ئـەوەش بێگومـان تەكفیـر كردنێكـی ڕاشـكاو بـێ پـەردەی موسـڵمانانی سـەردەمی خۆیەتـی بـه خەڵكـی گشـتی وزانایانـەوە!

## ستایشی بێ باوەڕان

بـا لـەو دەقانـەوە دەسـت پێبكەیـن كـه ستایشـی بێبـاوەڕان ومونافیقـەكان دەكات، بێگومـان ماقـوڵ نیـه ئـەوەی بـه خوێنـی موسـڵمانان تینـو بێـت، بێتـو ستایشـی بـێ بـاوەڕ و كافـران بـكات، یـان زاناكانـی ئەهلـی ئیسـلام تەكفیـر بـكات، وستایشـی خـو وڕەوشـتی كافـران بكات! بـەڵام یەكێـك لـه خەسـڵەتەكانی تونـد ڕەوی ئەوەیـه كـه هاوسـەنگی لـه دەسـتدانه وپێوەرەكـەی سـەقەت دەبێـت وەك چـۆن وەسـفی

خەواریجەکان لە فەرمودەیەکدا هاتوە (یقتلون اهل الاسلام ویدعون اهل الاوثان) [موسڵمانان دەکوژن و ئەهلی بتپەرستیش واز لێ دەهێنن!]
سەرەڕای ئەو ڕاستیەش وەک ئاماژەمان پێکرد، محمدی کوڕی عبد الوهاب مەرامێکی پەنهانی هەبوە لەدوای ستایشکردنی کافر وبێباوەڕەکان، ئەویش بۆ ڕزگار بوونی بوو لەو نیگەرانی ودڵەڕاوکێیەی کە لە ناخیدا پەنگی دەخواردەوە، لە ئەنجامی تاوانبار کردنی بە ڕشتنی خوێنی موسڵمانان. چاکترین نمونەی نوسینەکانی محمدی کوڕی عبد الوهاب نامیلکەیەکی بچوکی ئەوە بەناوی (کشف الشبهات) چونکە ئەو کتێبە سەرەڕای بچووکی قەبارەکەی، کتێبێکی زۆر گرنگە، وبایەخێکی لە ڕادەبەدەری پێدەدرێت لەلایەن لایەنگرانی شێخ وقوتابیانی، وئەو دەزگایانەی کە سەرقاڵی بڵاوکردنەوەی دەعوە وفیکری محمدی کوڕی عبد الوهابن. تا ئێستاش دەیان وسەدان چاپیشی لێ دەرچوە، بێ ئەوەی یەکێک لە شوێن کەوتوانی وەهابیەت، تەنها بۆ جارێکیش بێت سەرنجێکیشی لەسەر بنوسن، سەرەڕای ئەوەی پڕاوپڕە لە هەڵەی زەقی وەک تەکفیر وحەڵاڵ کردنی خوێنی موسڵمانان بە ناهەق.
هەر لە دەستپێکەوە محمدی کوڕی عبد الوهاب زۆر بە ئاشکرا دەیەوێت بڵێت کە خوا پێغەمبەرەکانی ناردوە بۆ مرۆڤایەتی تا قەدەغەیان کات لە زیادەڕەوی لە پیاو چاکان:
لە لاپەرە ٥: (اعلم رحمك الله أن التوحيد هو إفراد الله بالعبادة وهو دين الرسل الذين أرسلهم الله إلى عباده فأولهم نوح عليه السلام، أرسله الله إلى قومه لما غلوا في الصالحين وداً وسواعاً ويغوث ويعوق ونسراً...)
( بزانە ڕەحمەتی خوات لێ بێت، کە یەکتاپەرستی بریتیە لە تەنها پەرستنی خوا، وهەر ئەویش دینی ئەو پێغەمبەرانەیە کە خوا بۆ بەندەانی ناردوون، یەکەمیشیان نوح (سەلامی خوای لێ بێت) کە خوا بۆلای ئومەتەکەی ناردی کاتێک زیادەڕەویان کرد لە پیاوچاکانیان)!!!
ئەوەی زانراوە لە لایەن قوتابیەکی سەرەتاییش، کە لە قورئاندا هاتوە، کەوا خوا نوحی بۆلای ئومەتەکەی نارد لەبەر بتپەرستی، نەک لەبەر زیادەڕەوی لە ساڵحان. چونکە زۆر بە دەگمەن زیادەڕەوی دەگاتە ئاستی شیرک پەیدا کردن، ئەو قسانەش تەنها ڕێ خۆشکردنێکە بۆ سەلماندنی بیرۆکەی سەرەکی. چونکە نەیارانی محمدی کوڕی عبد الوهاب پێیان دەگوت: ئەوانەی تۆ لە دژیان

دەجەنگێیت وتەكفیریـان دەكەیـت خەڵكێكـی موسـڵمانن، ولەوانەیـە زیادەڕەویـەک لـە زاتـی پیـاو چـاكان، لـە لای عـەوام وزاناكانیـان هەبێـت، بـەڵام ئـەو زیادەڕەویـە هەقـی ئـەوەت پێـنادات لـە دژیـان بجەنگێیت، وتەكفیریـان بكەیـت، لەبـەر بـە هێـزی ئـەو ڕەخنەیـە ئەویـش هەمـوو كێشـەی پێغەمبـەران وقەومەكانـی كردۆتـە كێشـەی زیـادەڕەوی لـە سـاڵحان.

هـەر بـە دوای ئەوەشـدا هەمـوو پەیامەكـەی دوا پێغەمبەریـش بچـوک و كـورت دەكاتـەوە، لـە جەنگان دژی وێنـە و بتـی پیـاو چـاكان، بـە شـێوەیەک وەسـفی دەكات، دەیەوێـت لـە ئامانـج و ئەركـی سـەرەكی خـۆی لایبـدات، وەک بڵێـی تەنهـا هاتبێـت بـۆ شـكاندنی وێنـەی سـاڵحان، وەک لـە لاپـەڕە ٥-٦ : (وآخـر الرسـل محمـد (صلـى اللـه عليـه وآلـه وسـلم) وهـو الـذي كسـر صـور هـؤلاء الصالحيـن، أرسـله إلـى قـوم يتعبـدون ويحجـون ويتصدقـون ويذكـرون الله..ولكنهـم يجعلـون بعـض المخلوقـات وسـائط بينهـم وبيـن اللـه!)

«دوا پێغەمبـەر محمد (سـەلامی خـوای لـێ بێـت) ئـەو وێنـە وبوتـی ئـەو پیـاو چاكانـەی شـكاند، خـوا ناردبـووی بـۆ خەڵكانێـک كـە خواپەرسـتیان دەكـرد، وحەجیـان دەكـرد، و سـەدەقەیان دەكـرد وزیكـری خواشـیان دەكـرد!! بـەڵام ئـەوان (واتـە كافرەكانـی قورەیـش) چەنـد مەخلوقاتێكیـان دەكـردە نێوەنـد لـە نێـوان خۆیـان وخـوادا «

كێشـەكەی محمـدی كـوڕی عبـد الوهـاب لەگـەڵ خەڵـک، هەمـووی لـە تەقدیـس كردنـی پیـاو چاكـەكان ومەزارەكانیـان چـڕ دەكرێتـەوە، بۆیـە محمـدی كـوڕی عبـد الوهـاب دەیەوێـت ئـەو ناوەرۆكـە بەسـەر پەیامـی پێغەمبەریـش بسـەپێنێ، بۆیـە لـە بەشـی دووەمـی ئـەو دەقـەدا دەڵێـت: « بـەڵام ئـەوان (واتـە كافرەكانـی قورەیـش) چەنـد مەخلوقاتێكیـان دەكـردە نێوەنـد لـە نێـوان خۆیـان وخـوادا» واتـە تەنهـا كێشـەیەكیان هەبـوو بێـت ئـەو زیادەڕۆییەیـان (غلـو) بـوو لـە پیـاو چاكـەكان.

ئـەوەش بـۆ هەمـوو كەسـێک ئاشـكرایە كـە ڕاسـت نیـە، نـە خواپەرسـتیان خواپەرسـتی بـوو، نـە حەجیـان حـەج بـوو، نـە زیكـری خواشـیان بەڕاسـتی دەكـرد، ئـەو پێـدا هەڵگوتنـەش لـە پێنـاو ڕاسـتی دەرخەسـتن نیـە، ئەوەنـدەی لـە پێنـاو شـاردنەوەی تاوانێكـی گـەورەی كـوڕی عەبدولوەهابـە، ئەویـش حەڵاڵكردنـی كوشـتن وتـاڵان كردنـی موسـڵمانانە، هـەروەک دوایـی پیـادەی كـرد.

كەوابـوو بـە پێـی قسـەی محمـدی كـوڕی عبـد الوهـاب بێـت، بـێ باوەڕانـی قورەیـش كـە باوەڕیـان نـە بـە (لا إلـه إلا اللـه) و نـە ڕۆژی قیامـەت و نەبەهەشـت و نـە دۆزەخ

و نـه پێغەمبـەر هەبـوو، ئەوانـەی خـەریکـی بـت پەرسـتی بـوون، وزینایـان دەکـرد، منالّیـان زیندەبەچاڵ دەکرد، وئارەقیـان دەخـواردەوە، وسـویان دەخـوارد، وچەندیـن هەڵـەی دینـی تریـان دەکرد، ئـەو بێ باوەڕانـە وەک موسـڵمانان بـوون خواپەرسـتیان دەکـرد، وحەجیـان دەکـرد، وسـەدەقەیان دەکـرد وزیکـری خواشـیان دەکـرد!!

لـە ڕوانگـەی دینـی مـا قوڵـە ئـەوەی بـاوەڕی بـە هیـچ روکنێـک لـە ئەرکانـی ئیسـلام نەبێـت، یەکسـانی کەیـت وبەڵکـو پەسـنتدتری کەیـت بەسـەر ئـەو موسـڵمانانەی کـە باوەڕیـان بـە هەمـوو ئەرکانەکانـی ئیسـلام هەبێت، هـەر قورئـان دەڵێـت» (أفنجعـل المسـلمين كالمجرميـن، مالكـم كيـف تحكمـون)؟!

ئایـە یەکسـانە ئـەوەی بـاوەڕی بـە پێغەمبـەرە وتەوەسـولی پێـدەکات وتەبـەڕوک دەکات بـە سـاڵحان (هەتـا ئەگـەر هەڵـەش بێـت) لەگـەڵ ئـەوەی پێغەمبـەر بـە درۆزن دادەنێیـت، وبـە سـاحیر وکاهینـی لـە قەڵەم دەدا وپیاوچاک وساڵحانیشـی دەکوشـت؟!.

ئایـە یەکسـانە ئـەوەی بـاوەڕی بـە : (لا إلـه إلا اللـه) لەگـەڵ ئـەوەی دەیگـوت: (أجعـل الآلهـة إلهـاً واحـداً).

ئایـە یەکسـانە ئـەوەی داوای شـەفاعەت دەکات لـە پێغەمبـەر وسـاڵحان، دەزانێـت ئادەمیزادیشـن لەگـەڵ ئەوانـەی شـەفاعەتیان لـە بـت وجەمـاد وبـێ گیـان دا دەکـرد، ودەیانکردنـە هاوبەشـی خـودا لـە ئولوهیەتـدا؟!.

لە ستایشێکی تری بێباوەڕەکانی قوڕەیشدا دەڵێت:

ل٧: (وإلا فهـؤلاء المشـركون يشـهدون أن اللـه هـو الخالـق هـو وحـده لا شـريك لـه، وأنـه لا يـرزق إلا هـو، ولا يحيي ولا يميت إلا هـو ولا يدبـر الأمـر إلا هـو، وأن جميع السـموات ومـن فيهـن، والأرضيـن والسـبع ومـن فيهـن، كلهـم عبيـده وتحـت تصرفـه وقهـره، فـإذا أردت الدليـل علـى أن هـؤلاء الذيـن قاتلهـم رسـول اللـه صلـى اللـه عليـه وسـلم يشـهدون بهذا فاقـرأ قولـه تعالـى : (( قل مـن يرزقكـم مـن السـماء والأرض أمـن يملـك السـمع والأبصـار، ومـن يخـرج الحـي مـن الميـت ويخـرج الميـت مـن الحـي ومـن يدبـر الأمـر فسـيقولون اللـه فقل أفـلا تتقـون )) سـورة يونـس٣١.)

(موشـریکەکان (واتـە بێباوەڕەکانـی قوڕەیـش) شـایەتیان دەدا کـە بە تەنهـا خوا خالیقە، وبـێ هاوتایـە، وهـەر ئـەو رزق ورۆزی دەرە، ژیـان ومـردن بـە دەسـتی ئـەوە، هـەر ئـەو هەڵسـوڕێنەرە، وهەمـوو ئاسـمانەکان وئـەوەی تێشـیدان وهـەر حـەوت ئـەرزەکان وئەوانەشـی تێشـیدان هەمـووی بەنـدەی ئـەون ولـە ژێـر فەرمـان وئەمـری ئـەودان!!)

بڕوانە ئەو ستایشە ئاڵ ووالآیە، لەوانەیە بێباوەڕەكانی قورەیشەكان خۆیان زیندو بكرێنەوە وبیخوێننەوە باوەڕ ناكەن، ئەو وشانە لەسەر ئەوان نوسراوە! ما قولّە ئەو هەموو سیفەتە جەوهەرییانەی ئیمانیان تێدا بێت كەچی بەو شێوەیەی پێغەمبەر بەربەرەكانی كردبن؟! من پێموایە ئەگەر ئەو سیفەتانەی محمدی كوڕی عبد الوهاب داویەتە پاڵ بێباوەڕەكانی قورەیش ڕاست بان، هەرگیز ئەو هەموو شەڕ وشۆڕەی نەدەویست كەڕویدا. چونكە كوڕی عبد الوهاب باسی نكوڵی كردنی ئەوان ناكات لە پێغەمبەر ومەبدەئی پێغەمبەرایەتی ونوبوەت، ونكوڵی لە زیندوو بونەوە، وریبا خواردن، وزیندە بەچاڵ كردنی كچان، وبت پەرستی، وچەندین شتی تری خراپ.

زانایان دەڵێن ئەو ئایەتانەی كە لە قورئاندا هاتوە باسی ئیمانی بێباوەڕەكانی قورەیش دەكات، تەنها بریتیە لە دان هێنانی بێباوەڕان لە بابی (الإفحام والانقطاع) دەمكوتكردن وقسەبڕین، نەك لە بابی قەناعەتەوە، چونكە ئەگەر ڕاستگۆبان باوەڕیان دەهێنا، بۆیە خوا لە قورئاندا فەرمان بە پێغەمبەر دەكات كە پێویستیەتی ئەو دان پێداهێنانە جێبەجێ كەن: (فقل: أفلا تتقون) (قل: أفلا تذكرون)

بەڕاستی ناكرێت تۆ هەموو ئەو ئایەتانە ببینیت، كە واهیمەی خەڵكی فریودەدات گوایە لە ستایشی بێباوەڕانی قورەیشدا هاتوە، وهەموو ئەو ئایاتانەش كە ڕەخنە وسەركۆنەیە بۆیان پشت گوێی بخەی، كەچی ستایشكردنی موسڵمانانیش فەرامۆش كەیت وتەنها تەركیز لەسەر هەڵەكانیان بكەیت.! ناكرێت ئەو كارە بە وێنەی موسڵمان بكەیت، لە پێناو تەكفیر كردن و وجاردانی شەڕ لە دژیان، تا وا لە خەڵك بگەیەنین كە چۆن بێباوەڕەكان (شایەتیان دەدا كە بە تەنها خوا خالیقە، وبێ هاوتایە، وهەر ئەو رزق ورۆزی دەرە، ژیان ومردن بە دەستی ئەوە، هەر ئەو هەڵسوڕێنەرە، وهەموو ئاسمانەكان وئەوەی تێشیدان وهەر حەوت ئەرزەكان وئەوانەشی تێشیدان هەمووی بەندەی ئەون ولە ژێر فەرمان وئەمری ئەودان!!) لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر  شەڕی لە دژیاندا جاڕدا، منیش (واتە محمدی كوڕی عبد الوهاب) بە هەمان شێوە شەڕ بەرپا دەكەم لە دژی ئەو (بەناو ) موسڵمانانەی كە (نوێژ دەكەن وحەج دەكەن، وزەكات وێەدەقە دەدەن، وخواپەرستی دەكەن..هتد)

لە وێنەیەكی تری سەیرتر لەوانەی پێشو، شێخ محمدی كوڕی عبد الوهاب، بە جۆرێك زیادەڕۆیی دەكات لە وەسفی بێباوەڕانی قورەیش، تا ئەو ڕادەیەی سەیرت پێدێت، ئەو جەماعەتەی بە درێژایی وپانایی جیهانی ئیسلام، لە سەردەمی

محمدی کوڕی عبد الوهاب وشوێن کەوتوانی تا ئەو ڕۆژگارە، کەس نەماوە لە زانایانی کۆن ونوێ (لە ئەبو حەنیفەوە، وابی حامد الغزالی، وابن حجر العسقلانی وتەبەری وئەفغانی ومحمد عبده وشێخەکانی ئەزهەر وحسن البنا وسید قوتب ومالک بن نبی وسید سابق ومحمد الغزالی وقەرەزاوی وهتد) تەکفیر وتەبدیعی نەکەن، کەچی بەو شێوە سەیرە ستایشی بێباوەڕانی قورەیش دەکەن، بەلاَم ستایشەکە لەبەر چاوی کالَی ئەوان نییە، بەلَکو چەکێکە بۆ لێدانی موسلَمانانی تر وکوشتن وتالاَن کردنیان، ئەم جارە دەربارەیان دەلَێت لە لاپەڕە ٩: (کما کانوا یدعون الله سبحانه لیلا ونهاراً، ثم منهم من یدعو الملائکة لأجل صلاحهم وقربهم من الله لیشفعوا له أو یدعو رجلاً صالحاً، مثل اللات أو نبیاً مثل عیسی .وعرفت أن رسول الله صلی الله علیه وسلم قاتلهم علی هذا الشرك ودعاهم إلی إخلاص العبادة لله وحده، کما قال الله تعالی : (( فلا تدعوا مع الله أحد )) سورة الجن ١٨
(ئەوان بە شەو وڕۆژ هاواری خوایان دەکرد...) ئەگەر ئەو بێ باوەڕانە هێندە خوایی بان، لە وانەبوو هاوەلاَنی پێغەمبەر ئێرەییان پێ بردبان، ئەگەر ئەو موشریکانە بە شەو رۆژ بانگی خوایان کردبێت وئەویان پەرستبێت، ئەوە خوا لە قورئاندا نەیدەگوت»: (قل إنی نهیت ان اعبد الذین تدعون من دون اللە..)... (إن الذین تدعون من دون اللە عباد امثالکم..)، (قالوا ربنا هؤلاء شرکاؤنا الذین ندعو من دونک..)
ئینجا لە بارەی ئەو دیاریکردنە وردەی مەرامی پەیامی پێغەمبەر (ێ) دەلَێت: (وتحققت أن رسول اللە صلی اللە علیە وسلم قاتلهم لیکون الدعاء کلە للە، والنذر کلە للە والذبح کلە للە، والاستغاثة کلها باللە، وجمیع أنواع العبادات کلها للە .)
لە قورئاندا نەهاتوە کە هۆی شەڕکردنی پێغەمبەر (ص) لەگەلَ موشریکەکان لە پێناو ئەوە بوو سەربڕینی ئاژەلَەکان تەنها بۆ خوا بێت، نەزرکردن تەنها بۆ خوا بێت، وهاوارکردن تەنها بۆ خوا بێت وەک محمدی کوڕی عبد الوهاب وای بۆ چوو بوو، بەلَکو لەبەر چەند هۆیەکی سەرەکی بوو کە بریتیبوون لە شیرکی هەرە گەورە ونکولی کردن لە پێغەمبەرایەتی ووەدەرنانی موسلَمانان لە مالَ وموڵکیان.
وادیارە شێخ محمدی کوڕی عبد الوهاب، هۆیەکانی شەڕکردنی پێغەمبەر دەگەڕێنێتەوە بۆ هۆگەلێکی بچوک وپڕ لە شوبهە، کە لە دەقەکاندا باسیان نەکراوە وسەلماندنیان ئەستەمە، کەچی هۆکارە گەورەکان فەرامۆش دەکات، کە

لـە دەقەكانـی قورئانـدا هاتـوە سـەبارەت بـە هۆیەكانـی بەگژداچوونـی پێغەمبـەر بـۆ موشـریكەكانی قورەیـش.

شیركی كۆنەكان زۆر چاكتر لە شیركی موسڵمانانی ئەمڕۆ!

لـە بەراوردێكـی تـردا زۆر ڕاشـكاوانە پـاش بـە موشـریک كردنـی سـەرتاسـەری موسـڵمانان، دێت ودەڵێت شـیركی كۆنـەكان زۆر چاكتـر وسـوكتر بـوو لـە شـیركی موسـڵمانانی سـەردەمی كـوڕی عبدالوهـاب:

فاعلم أن شرك الأولين أخف من شرك أهل زماننا بأمرين:

أحدهمـا : أن الأوليـن لا يشـركون ولا يدعـون الملائكـة والأوليـاء والأوثـان مـع الله إلا فـي الرخـاء . وأمـا فـي الشـدة فيخلصـون لله الدعـاء. كمـا قـال تعالـى : (( وإذا مسـكم الضـر فـي البحـر ضـل مـن تدعـون إلا إيـاه، فلمـا نجاكـم إلـى البـر أعرضتـم وكان الإنسـان كفـوراً )) سـورة الإسـراء آيـة :٦٧ .....الـخ

الأمـر الثانـي : أن الأوليـن يدعـون مـع الله أناسـاً مقربيـن عنـد الله إمـا أنبيـاء وإمـا أوليـاء، وإمـا ملائكـة، أو يدعـون أشـجاراً أو أحجـاراً مطيعـة لله ليسـت عاصيـة. وأهـل زماننـا يدعـون مـع الله أناسـاً مـن أفسـق النـاس .))

(بزانـە شـیركی بەراییـەكان سـوكتر بـوو لـە شـیركی خەڵكـی ئـەو زەمانـە لەبـەر دوو خاڵ:

یەكێكیـان: لەبـەر ئـەوەی خەڵكـی بەرایـی تەنهـا لـە كاتـی ئاسـوودەیی و خۆشـیدا شـیركیان دەكـرد ونزایـان لـە فریشـتەكان وپیـاو چـاكان وبتـەكان دەكـرد، بـەڵام لـە كاتـی تەنگەتـاوی وناچـاری بـە دڵسـۆزی دوعایـان لـە خـوا دەكـرد. وەک خـوای پـەروەردگار لـە قورئـان دا دەڵێت: (ئەگـەر دوچـاری مەترسـی بـوون لـە نێـو دەریـا تەنهـا هـاوار بـۆ خـوا دەكـەن، كـە دەربـازی كـردن بـۆ وشـكایی، تـەوەلا دەكـەن، بەڕاسـتی ئادەمیـزاد بـێ ئەمەكـە)

دووەمیـان: بەراییـەكان لەگـەڵ خـوا دوعـا وپاڕانەوەیـان لـە كەسـانی نزیـک لـە خـوا دەكـرد وەک پێغەمبـەران وپیـاو چـاكان، یـان فریشـتە، یـان دار وبـەرد كـە لـە خـوا عاسـێ نیـن ومـل كەچـن، بـەڵام خەڵكـی ئـەو زەمانـەی ئێمـە لەگـەڵ خـوا دوعـا وپاڕانـەوە لـە فاسـیقترین كـەس دەكـەن)!!

لـە بـارەی ئـەو دوو هۆیـەی كـە محمدی كوڕی عبد الوهـاب موشـریكە بەراییەكانـی پـێ پەسـند دەكات بەسـەر موسـڵمانانی سـەردەمی خـۆی (یـان موشـریكەكانی زەمانـی

خۆی) دەڵێن: جاریێ ئەو ئایەتەی کە هێناویەتیەوە تایبەت نیە بە موشریکەکانی بەرایی، بەڵکو ئاماژەیەکی ڕەهایە بۆ ئادەمیزاد لە هەر زەمان ومەکانێکدا، واتە مرۆڤ لە تەنگانەدا هەردەم پەنا بۆ هێزێکی گەورەی پەنهانی دەبات کە خوایە. بە گوێرەی دوەمیش ئەوە هەر پۆلیشکردنی بێباوەڕانی بەراییە، لە عیبادەتەکانیان ئەگینا ئەوان کەی پێغەمبەرانیان دەناسی، وکوانێ کتێبی پیرۆزیان بەر لە قورئان، کوانێ حەلال وحەرامیان؟!

ئەوان هەر دوعایان لە پێغەمبەران وپیاو چاکان، یان فریشتە، یان دار وبەرد نەدەکرد، بەڵکو تەقدیسی چەند ئەستێرە وئاژەڵیشیان دەکرد وشوێنەواری تەسلیسیش (سێیانەیی) بە ئاشکرا لە پەرستکاریەکانیاندا دیار بوو، وەک پەرستنی بە کۆمەڵی سێ شت وەک مانگ وخۆر وئەستێرەی زوهرە. هەروەها پەرستنی ئاگریش هەر باو بو،و بۆ نمونە لەکاتی پەیمان بەستنیان ئاگریان دەکردەوە، ونزای باران بارینیان لە ئاگر دەکرد، وقوربانیان بۆ ئاگر سەردەبڕی، بە کاریگەری ئایینی مەجوسەکان هەتا دەڵێن چەند مەجوسیەت تا ڕادەیەکی باش بڵاوببۆوە لە تەمیم وعومان وبەحرەین.

بەڕاستی ئەو پەڕی نەزانی و بێ ئینسافییە ئەو بەراوردە پڕ لە کێشەیە بکەیت لە نێوان کەسانێکی ئەو سەردەمە و موسڵمانانی سەردەمی خۆی! چونکە کەوابێت پەیامی ئیسلام خەڵکەکەی خراپتر کردوە، و فەشەلی هێناوە پاش هەزار ساڵ زیاتر هیچ گۆڕانکاریەکیان تێدا دروست بکات!

هەرنەبێ موسڵمانانی ئەو سەردەمە زینا وئارەق ودزی وکوشتنی بە ناهەق لەلایەن حەرام بوو، خۆ هەر نەبێت وەک موشریکەکانی بەرایی، کوڕی گەورە لە پاش مردنی باوکی دەستی بەسەر ژنی باوکی دا نەدەگرت! هەر نەبێ موسڵمانانی ئەو سەردەمە وەک خەڵکی بەرایی بە ڕووتی لە دەورەی کەعبە نە دەسوڕانەوە، چونکە گوایە نابێت لە دەورەی کەعبە بە جلی کۆن بخولێیتەوە، بۆیە ئەگەر جلی نوێیان دەست نەکەوتبا بە ڕووتی دەسوڕانەوە! هەر نەبێ کچیان زیندە بەچاڵ نەدەکرد، ئەگەرچی زیندە بەماڵیان دەکردن، بەلام ئەوەیان هێشتا ئهوەنتر بوو لە تاوانی زیندەبەچاڵکردنی هەندێ لە موسریکەکانی بەرایی.

لەپاش ئەو قسانە محمدی کوڕی عبد الوهاب بەو پەڕی متمانە بە خۆوە دەڵێت:

"إذا تحققت أن الذين قاتلهم رسول الله صلى الله عليه وسلم أصح عقولاً، وأخف شركاً من هؤلاء"!!

(كەوابوو بۆت بە دیار كەوت كە ئەوانەی پێغەمبەر لە دژیان دەجەنگا، عاقڵتر بوون وشیركیشیان خەفیفتر بوو) دوا پرسیار لەو عەقڵیەتە وشك وبێ سەروبەرە ئەوەیە: ئایا هیچ جیاوازیەك هەیە لە نێوان شیركێك وشیركێكی تر؟! بە پێی لۆژیكی سەلەفییەت نەخێر هەموو شیركێك هەر شیركە)
نەك هەر هێندە بەڵكو محمدی كوڕی عبد الوهاب پێی وایە جاهیلەكانی بەرایی چاكتر لە مانای (لا الە الا اللە) تێدەگەیشتن، پاش لێكدانەوەیەكی دورو درێژ بۆ وتەی (لا الە الا اللە) دەڵێت: [ئەگەر زانیت كە كافرە نەزانەكان ئەوەیان دەزانی وتێیدەگەیشتن، سەیر ئەوەیە كەسانێك گوایە لەسەر دینی ئیسلامن و تەفسیری ئەو وتەیە –مەبەستی لا الە الا اللە یە– نازانن، وەك كافرە نەزانەكان دەیانزانی! بەڵكو وادەزانێت ئەوە تەنها گۆكردنی پیتەكانە، بێ باوەڕی دڵ بە ماناكانی]!! "فإذا عرفت أن جهال الكفار يعرفون ذلك، فالعجب ممن يدعي الإسلام وهو لا يعرف تفسير هذه الكلمة كما عرفه جهال الكفار بل يظن أن ذلك هو التلفظ بحروفها من غير اعتقاد القلب لشيء من المعاني ".

كانونی دووەم ٢٠٠٩ گۆڤاری ستاندارد

## بە کۆیلەکردنی ئافرەت لەلایەن وەهابیەتەوە

ئافرەت لەلای وەهابیەت دیل و بێ کەرامەتە، لە هەردوو حالەتی دیلی و ئازادی، مەبەست لە ئازادی بە مانای پێچەوانەی کۆیلایەتی، نەک ئازادی بە چەمکە فەلسەفی و مرۆییەکەی.
داعش لە زۆر ڕووەوە کۆپیەکی کتومتی ئیسلامێکی مێژوویی و وەهابیەتە، لە ڕەفتاری زبری، لە تەکفیرکردنی خەڵک، لە دژایەتی هەموو موسڵمانانی دەرەوەی بازنەی خۆیان،
لە سەربڕینی خەڵک، و لە گومانی ڕەش کردن لە هەموو خەڵک، تەنها شتێک ئەگەر کەمێک جێگای گومان بێت دەربارەی وەهابیەت ئەوەیە ئایە: وەهابیەت وەک داعش ژنان و کچانی خەڵکیان بە کۆیلە دەبرد!
ئەگەر سەلمێندرا وایان دەکرد، کەوابوو وەهابیەت کە ئەمڕۆ مەزهەبی ڕەسمی وڵاتێکی وەک سعودیەیە، زۆر نەگریسترە و نەگریستر بووە لە داعش، ئەو کاتەش دەبێت خەڵک هیچیتر نەڵێن لە داعش خراپتر نەهاتووە. چونکە داعش ئەگەر کچان و ژنانی یەزیدی بە کۆیلە کردبێت، بەوەی کە دینێکی غەیری ئیسلام بن، یان [کافر] بن، ئەوە وەهابیەت ژنانی خودی موسڵمانانی جەزیرەی موبارەکی عەرەبی سەبی و کۆیلە کردوە! وەک دەزانین هیچ دینیتر لە جەزیرە نییە لە غەیری ئیسلام!
دانەرەکانی مێژووی وەهابیەت وەک ئیبن بشر لە [عنوان المجد في تاريخ النجد] هەموو شتێکی زۆر ئاشکرا گووتوە، بەڵام لە باسکردنی چارەنووسی ئافرەت و منداڵەکاندا زۆر بە شێوەیەکی گوماناوی و لێڵ پەردەپۆشی دەکات! بۆ نموونە کە باسی هەڵمەت و هێرشەکانی لە شکری وەهابیەت دەکات، دەڵێن لە ڕۆژی فلاندا موسڵمانان هێرشیان کردە سەر موشریکەکانی فلانە شار و لادێ، و تێیان کەوتن و هەموویان قڕکردن، دەستیان گرت بەسەر غەنیمەت و دەست کەوتێکی زۆر! ئەوە چەند نمونەیەکە:
باسی دهام ناوێک دەکات دەڵێت: یەکەم ئاماژەی دوژمنایەتی هێرشکردنی بوو بۆ سەر مەنفوحە کە هاتبوونە ناو ئەو دینەوە! یانی دینی وەهابیەت «فاول ما ظهر من عداوته انة عدا علي اهل المنفوحة، وهم قد دخلوا في هذا الدين» ل ٥٠[.
ئیبن دەواس دۆڕا لەگەل ئەوانەی لەگەڵی بوون، و موسڵمانانیش دوایان کەوتن]

«انهزم ابن دواس ومن معه و المسلمون في اثرهم» ل ٥٢]. تێیدا شەڕی بەتین ڕوویدا، کە شەڕێکی مەزن بوو لە نێوان موسڵمانان و خەڵکی سەرمەدا] «وفیها جرت وقعة البطین وهي وقعة عظیمة بین المسلمین و اهل الثرمدا» ل ٥٨
ئەوەی کە مرۆڤ دەخاتە بیرکردنەوە ئەوەیە کە چارەنووسی ئەو سەدان و هەزاران ژنان و کچانی پیاوە [موشریکە] کوژراوەکان چی بوو؟ بۆ مێژوونووسانی وەهابیەت دیزە بەدەرخونەی دەکەن؟! ئەگەر پیاوان موشریک بن و لەناو ببردرێن، ئەگەر کەل وپەل و ماڵیان بە تالان بردرابێت، باشە چۆن ئەو ژن و کچانەیان بوارد لە حوکمی موشریکی؟! ئەگەر لە سەردەمی ئەمەویەکان کە هێشتا سەحابەیەکی زۆروزەوەند لە هەردوولا مابوون، کاتێ هێرشیان کرد و مەدینەیان گرت، لەشکری ئومەویەکان دەستیان لە کچ و ژنانی سەحابە نەپاراست، کە ئەو کاتە هیچ لایەکیان ئەویتری پێ کافریش نەبوو، دەتەوێ ئەو لەشکرە بەدەویە ئەعرابیە قێزەونە بێ سەلیقەکەی محمدی کوڕی عەبدەلوەهاب، دەست بپارێزن لەو ژن و منداڵ و کچانەی کە مابوونەوە، سەرگەردانی دەشت وکێوان ببوون، کە بە موشریک وکافریشیانیان دەزانی، بە شایەدی نووسەری [عنوان المجد في تاریخ النجد]!؟
ئەو تیرۆرستانەی داعش لە سەردەمی تەکنۆلۆژیای زانیاریەوە، بە بەر چاوی هەموو دنیا کارە قێزەون و دڕندەکانیان دەکەن بە دەنگ و وێنە، ئەو دەوارنشین و ئەعرابیە دەروون پیس و بەدوە چاو برسی و شەهوانیانە، تۆ بڵێی چاویان پۆشیبێت لە هەزاران کچۆڵە وژن و منداڵ لەو دەشت و کێوە؟!
نەخێر دەستیان نەپاراستوە، بەڵام یان لەبەر هەستیاری بابەتەکە نەوێراون باسی بکەن، کە من ئەوە بە دوور دەزانم، چونکە هێندە هەستیار نەبوون و نین! یانیش باسیان کردوە بەڵام لە سەردەمی چاپکردنی کتێبە کۆنە مێژووییەکانی مێژووی وەهابیەت، دەکرێت ئەو زانیاریانە لابرابن، تا ئیحراجی بۆ دەوڵەتی سعودیە دروست نەکەن کە پارێزەری دەعوەی وەهابیەتە! دەستکاری کردن و تەزویری کتێبە کۆنەکان لەلایەن سەلەفیەکان زۆر باسێکی ناوداره لە نێوەندی ڕۆشنبیریدا!

## ٢

ئێستاش کەمیک ئاماژە ماوە بۆ ئەو زانیاریانە بۆ نمونە، لە بابەتێکدا لە [عنوان المجد في تاريخ النجد] بەناوی (عهد الامام سعود بن عبدالعزيز) کە لە ١٢٢٩ هیجری مردوە، دەڵێت: « وذكر لي رجل كان عندهم في القصر يعلم القرآن... وملك من الخيل العتاق الفا و اربعمائة فرس، يغزو معة ستمائة فرس، قال: ومماليكه الف ومائتين الذكور و النساء» پیاوێکی فێرکەری قورئانی ناو کۆشکی سعودی کوڕی عبد العزيز باسی سامان و موڵکەکانی ئیمام سعودی بۆ کردوە و دەڵێت ١٤٠٠ ئەسپی هەیە و هەروەها ١٢٠٠ کۆیلەی نیر ومێی هەیە! ل٢٥٢، [عنوان المجد في تاريخ النجد] عثمان بن عبدالله بن بشر، الطبعة الرابعة ١٤٠٢ هـ - ١٩٨٢ م الرياض، مطبوعات دارة الملك عبدالعزيز..

باشە ئەو مەلیکە بەدەوییە کە لە ترسی دەوڵەتی عوسمانی و میسری نە دەوێرا سەری لە غەیری جەزیرە بەرزکاتەوە، لەو سەردەمە کە بازرگانی کۆیلە زۆر بەر تەسک ببوەوە، و فتوحاتی موبارەکی ئیسلامیش راوەستا بوو، ئەو هەموو کۆیلەیەی لە کوێ بوو؟! ئەوە بێگومان ئەو ژن و منداڵ و کچانە بوون کە پیاوەکانیان دەکوشتن. بێگومان هەرماڵێکیش لەو ماڵانەی جەنگاوەرە وەهابییەکان دوو سێیەک کۆیلەی تێدابووە، بەڵام لەبەر نەبوونی میدیا و راگەیاندن لەو ڕۆژگارە، بابەتەکە هەمووی شاردراوەتەوە، و کەس پێی نەزانیوە.

ئەگەر بچینە سەر گەواهی ئەوانەی ناحەز بوون بە وەهابیەت وەک موفتی شافیعیەکانی مەککە، (السيد أحمد بن زيني دحلان) لە کتێبی (فتنه الوهابيه) دەڵێت: « « وقتلوا من الخلائق ما لا يحصون واستباحوا أموالهم وسبوا نساءهم « [خەڵکێکی لە ژمار نەهاتوویان کوشت، و ماڵیان تالان کردن و ئافرەتانیان سەبی کردن] ل ٣.

سەیر لەوەدایە مەلا و زانا دینیەکان هەر دەویان بکەنەوە، دەڵێن ئیسلام دینی فیترەت و سروشتە، کەچی نازانم چۆن فیترەت و سروشت قبوڵ دەکات ژن و کچی خەڵکێک جاروبار ناسراویش بن، و بکاتە موڵکی خۆی و دەستدرێژی سێکسیان بکاتە سەر؟! هەتا سەحابیەکانیش فیترەتیان دژی ئەو کارە بوو، هەستیان بە ئیحراجی کردوە، کاتێک پێیان وتراوە ئەو ژن و کچانەتان بۆ حەڵاڵە! لە سەحیحی

موسليم لە [باب جواز وطء المسبية بعد الاستبراء وإن كان لها زوج انفسخ نكاحها بالسبي ] بەشی جائیزی سێکسکردن لەگەڵ ئافرەتی سەبیکراو پاش پاکبونەوەی رەحمی، و هەڵوەشانەوەی زەواجی سەبیکراوەکە و بە سەبی کردنی!

(حدثنا عبيد الله بن عمر بن ميسرة القواريري حدثنا يزيد بن زريع حدثنا سعيد بن أبي عروبة عن قتادة عن صالح أبي الخليل عن أبي علقمة الهاشمي عن أبي سعيد الخدري أن رسول الله صلي الله عليه وسلم يوم حنين بعث جيشا إلي أوطاس فلقوا عدوا فقاتلوهم فظهروا عليهم وأصابوا لهم سبايا فكأن ناسا من أصحاب رسول الله صلي الله عليه وسلم تحرجوا من غشيانهن من أجل أزواجهن من المشركين فأنزل الله عز وجل في ذلك والمحصنات من النساء إلا ما ملكت أيمانكم أي فهن لكم حلال إذا انقضت عدتهن وحدثنا أبو بكر... حدث أن أبا سعيد الخدري حدثهم أن نبي الله صلي الله عليه وسلم بعث يوم حنين سرية بمعني حديث يزيد بن زريع غير أنه قال إلا ما ملكت أيمانكم منهن فحلال لكم ولم يذكر إذا انقضت عدتهن ... المكتبة الاسلامية http://library.islamweb.net/newlibrary/display_book.php...

[پێغەمبەر ڕۆژی شەڕی حنین لەشکریکی ناردوە بۆ سەر ئەوتاس کە ڕوبەڕووی دوژمنان بونەوە و سەریان کەوتوون، چەندین ئافرەتیان دیلکرد و چنگ کەوت، وەک بڵێی کەسانێک لە ئەسحابی پێغەمبەر، هەستیان بە ئیحراجی کرد لەگەڵیان جووت بن لەبەر مێردەکانیان لە موشریکەکان، خوداش ئەو ئایەتەی بۆ ناردنە خوارەوە:[ والمحصنات من النساء إلا ما ملكت أيمانكم ] واتە ئەو موڵکی یەمینانە حەڵاڵن بۆ ئێوە ئەگەر عیدەیان بەسەرچوو،،،لە ڕیوایەتی دووەمدا دەڵێت هەر چاوەڕێی عیدەشی ناوێت!]

دیارە ئەگەر ئەو ڕیوایەتە ڕاست بیت کە لە کتێبێکە بە سێیەم سەرچاوەی ڕاستی ئیسلام دەژمێردرێت پاش قورئان و بوخاری، ئەوە ئەسحابەکان ژنان و کچانی دۆست و ناسیاوە موشریکەکانیان دەست کەوتووە، فیترەتیان دژی ئەوە بوە دەستدرێژی سێکسیان بکەنە سەر، بەڵام لە ژێر فەرمایشتی قورئان و پێغەمبەر فیترەتیان گۆڕیوە، بۆ حاڵەتێک کە جووت بوون و دەستدرێژی کردنە سەر ئافرەتانی خەڵکی غەیرە ئیسلام ببێتە شتێکی ئاسایی، وەک ئەو پیاوە عەرەبەی دەستدرێژی کردبووە سەر کچە یەزیدیەک، سەرەرای ئەوەی هاوسێ و بەردەوام مێوانی ماڵیان و هاوڕێی نزیکی باوکی بووا ئێستاش سەرەڕای ئەو

هەموو توراسە، لە حەدیس و تەفسیر و فیقە هێشتا فیترەتی زۆربەی موسڵمانان، هەتا بەشێکی لە سەلەفیەکانیش دژی ئەو دەستدرێژی کردنە سەر ناموسی ئافرەتانی خەڵکە! پرسیار لە هەر موسڵمانێکی ئاسایی و زانا دەکەیت هەست بە ئیحراجی دەکات دەربارەی موڵکی یەمین، هەتا هەندێکیان لە ئیحراجیان نکوڵی لە سەرتاسەری عەبدایەتی وسەبایە دەکەن! کەوابوو کامەیان فیترەت تێکدانە؟!

٢٠١٥/٨/٣١

بەشی پێنجەم

# ئیبن عومەر

سەرچاوەیەکی گەورەی سەلەفییەت و مەدخەلیزم!

- تەقوا و شوێن کەوتنێکی نا عەقڵانی سونەت!
- ئیبن عومەر و حەزی ئافرەت!
- دەڵاڵی کەنیزە کڕین!

وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعەکان!

- شیعە و سونە هەمان تێڕوانین بۆ ئافرەت!
- پایەی نهج البلاغة

کیسەکەی ئەبو هورەیرە یان کارخانەی حەدیس!

- عوزر و شاهێدە مردووەکانی ئەبو هورەیرە!

معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان

- کاریگەری معاویە وئومەویەکان بەسەر ئیسلام وموسڵماناندا
- نوسەری وەحی
- یەزیدیش فەزائیلی هەیە وبە شورا وهەڵبژاردنیش هاتە سەر دەسەڵات!!

# ئیبن عومەر

## سەرچاوەیەکی گەورەی سەلەفییەت و مەدخەلیزم!
## ا

ئیبـن عومـەر سـەحابەیەکی هـەرە گـەورە و نـاوداری پێغەمبـەرە، چـی نەمابـوو شـوهرەتی پێش شـوهرەتی باوکی، خەلیفە عومـەری کوڕی خەتـاب بکەوێت. ئیبن عومـەر لـە هەیکەلی تیۆری سـەلەفییەت ،یەکێکە لەوانەی دەکەوێتە ناوەندی تیۆرەکە، و یەکێکـە لـە گرنگتریـن کەسـایەتیەکانی سـەلەفی سـاڵحی سـەلەفیەکان! نازانـم و ناتوانـم بـە وردی دەستنیشـانی ئـەوە بکـەم کـە ئایـە ئیبـن عومـەر کاریگـەری لەسـەر سـەلەفییەت دروسـت کـردوە، بـەو ڕەفتـار وڕەوشـتە سـەلەفیانەی کـە هەیبـووە، یـان سـەلەفییەت وێنـای ئیبـن عومەریـان بەپێـی تیۆرەکانـی خۆیانـدا کێشـاوە!
ئیبـن عومـەر زۆر سـتایش کـراوە لـە ئەدەبیاتـی سـەلەفی، تـا ڕادەی ئـەوەی نـەک هـەر لـە عومـەری کـوڕی خەتابـی باوکـی تێیـان پەڕانـدوە، بەڵکـو عیبادەتکـردن و سـونەتپارێزی دەڵێـن بـە جۆرێـک بـووە بـە پێغەمبەریشـی دەچوێنـن!
ابن المسیب دەڵێت: ئەگـەر شـاهێدی بەهەشـت بۆ کەسـێک بـدەم، ئـەوە شـاهێدی بۆ ئیبـن عومـەر دەدەم! «لـو شـهدت لأحد أنـه مـن أهـل الجنـة لشـهدت لابـن عمـر . «
قەتادەش دەڵێت گوێم لێبوو ابـن المسـیب دەیگـووت: ئـەو ڕۆژەی ئیبـن عومـەر مـرد چاکترینـی زیندوەکان. بـوو! «سـمعت ابـن المسـیب یقـول : کان ابـن عمـر یـوم مـات خیـر مـن بقـي . «
تـاوس یـش دەڵێـت: لـە ئیبـن عومـەرم بـە تەقواتـر نـە دیتـوە! «وعـن طـاوس : مـا رأیـت أورع مـن ابـن عمـر.»
ئیبـن حەنەفیـە ش دەڵێـت: ئیبـن عومـەر چاکترینـی ئـەو ئومەتـە بـوو! «عـن ابـن الحنفیـة : کان ابـن عمـر خیـر هـذه الأمـة .»

# باوکێکی دامەزرێنەری سەلەفییەتی حەنبەلیزم و مەدخەلیزم!

سەلەفیەکان و ئەهلی سەلەف بە گشتی چونکە حەزیان بە چارەی عەلی کوڕی تالیب نەبوو، ئەگەرچی بە ئاشکراش وانالێن، بەلام بە هەڵوێستی ئیبن عومەر زۆر دڵخۆش بوون، کە لە شەڕی علی ومعاویە نەچووە پاڵ عەلی، هەر بۆیەش وا ستایشی زۆری دەکەن، و درۆی شاخداریشی بۆ هەڵدەبەستن هەتا لەو بوارەی کەتیایدا زۆر کلۆڵ بوە، وەک مەیدانی شەڕ وئازایەتی بۆ نمونە.! وەک ئەو ڕیوایەتەی کە دەڵێت: ئیبن عومەر بە ڕێگادا دەڕۆیشت دیتی شێرێک ڕێگای خەڵکی گرتوە، ئیبن عومەر لە وشترەکەی دابەزی چوە لای شێرەکە و گوێی بادا و دووری خستەوە لەسەر ڕێگا!!! ئەوە مەگەر شێرە پەڕۆینەکانی شنۆگەریەکان بێت!

عن وهب بن أبان القرشي ; أن ابن عمر خرج، فبينما هو يسير، إذا أسد على الطريق قد حبس الناس، فاستخف ابن عمر راحلته، ونزل إلى الأسد، فعرك أذنه، وأخره عن الطريق؟ .

ئەگەر هێندە ئازا و سوارچاک بووە، چۆن وەلامی معاویەی نەدایەوە کە لەسەر مینبەر گووتی: ئەوەی دەیەوێت باسی خەلافەت بکات با شاخەکانی یان قۆچەکانی بەرزکاتەوە، ئێمە لە خۆیی و باوکی موستەهەقترین! ئیبن عومەر دەڵێت: ویستم بڵێم ئەوانە موستەهەقترینن، کە شەڕی تۆ و باوکتیان کرد لەسەر ئیسلام، بەس ترسام دووبەرەکێ دروست کەم!

زۆربەی ئەو کاتانەی پێویستی بە هەڵوێستی ابن عمر بووە، تیایدا یان دەڵێت ویستم وا بڵێم یان وا بکەم، هەتا لەسەر مردنیش دەیگووت: ئەوەی ئەسەفی بۆ دەکێشم ئەوەیە کە نەچوومە پاڵ لەشکری عەلی لە شەڕ دژی بەنی ئومەیە! ئەوەش پاش ئەوەی خزمەت نەما بە بەنی ئومەیەی نەکات، قسەی پڕ تۆمەت وئیدانەی دژی هەر یاخی بوونێک دەکرد لە دژی بەنی ئومەیە، سەرەڕای سوکایەتی بەنی ئومەیە بەو!

کاتێ عەلی بوە خەلیفە لە پاش کوشتنی عوسمان، کە زۆربەی هەرە زۆری هاوەلانی پێغەمبەر بەیعەتیان پێی کردبوو، ئیبن عومەر بەیعەتی پێ نەدا، بە بیانووی بوونی فیتنە و کێشەی لەگەڵ معاویەدا، هەرچەندە ئەو دەیزانی معاویە هی ئەوە نییە بەراورد بکرێت لەگەڵ پایەی عەلی...لەو بەیعەتەدا دوو دڵی کرد، بەلام کە معاویە بە هەزار فڕوفێڵ خۆی کردە خەلیفە، هەر زوو بە زوو

بەیعەتی پێکرد! معاویەش گووتمان قەیناکا بە پێکهاتن لەگەڵ حەسەنی کوڕی عەلی پێکهاتن، بەڵام کاتێ معاویە یەزیدی کردە جێگری خۆیی، و خەلیفەی دوای خۆی،بە هەڕەشە و گورەشە بە جۆرێک هەتا قسەی دزێوی بە سەحابە و ئیبن عومەریش گووت و هەڕەشەی لێ کرد دەمبکاتەوە!

سەرەڕای ئەوەش لە ترسان تا مرد، لە بەیعەتی یەزید دەرنەچوو، هەرچەندە یەزید نەفرەت لێکراو بوو، لەسەر زمانی هەموو هاوەڵان و زانایانی ئیسلام، کەچی کاتێک عبدالله ی کوڕی زوبێر لە دژی یەزید ڕاپەڕی، بە خراپترین شێوە دژایەتی کرد!

خەڵکی لە دژی هان دەدا وداوای لێدەکردن پشتگیری بەنی ئومەیە بکەن!

بۆ بەیعەتدان بە عەلی و عبدالله ابن الزبیر، کە لە هەرە هاوەڵە نزیکەکانی پێغەمبەر بوون، دوو دڵی وڕاڕایی دەکرد، وبەڵکو دژایەتیشی دەکردن، چونکە ئەوان وەک بەنی ئومەیە نەبوون ڕێز ورەوشتیان تێدا بوو، وەک حەجاج سوکایەتیان پێ نەدەکرد، بۆیە لە سزای ئەوان نەدەترسا، بەڵام بۆ معاویە و کوڕە داوێن پیس و بەدڕەوشتەکەی زەندەقی چووبوو، زوو زوو بەیعەتی پێ دەدا، و دەیگووت دەترسم بمرم بە جاهیلی ئەگەر بەیعەتی خەلیفە لە مل و گەردنم نەبێت!

ئیبن عومەر ئەو حەدیسانەی بۆ عەلی و ابن الزبیر لە بیر نەبوو، کەچی بۆ معاویە ویەزید و عبدالملک بەبیری بوون! ( مَنْ خَلَعَ يَدًا مِنْ طَاعَةٍ لَقِيَ اللَّهَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لا حُجَّةَ لَهُ، وَمَنْ مَاتَ وَلَيْسَ فِي عُنُقِهِ بَيْعَةٌ مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيَّةً). رواه مسلم [ئەوەی دەستی لە گوێڕایەڵی هەڵگرت، لە بەرامبەر خودادا بێ عوزر دەبێت، ئەوەشی مرد و بەیعەت لە گەردنی نەبێت، مردنێکی نەفامیانە دەمرێت]

یان ئەو حەدیسەی بوخاری: روى البخاري بسنده عن نافع قال: لما خلع أهل المدينة يزيد بن معاوية، جمع ابن عمر حشمه وولده، فقال: «إني سمعت النبي صلى الله عليه وسلم يقول: (ينصب لكل غادر لواء يوم القيامة). وإنا قد بايعنا هذا الرجل على بيع الله ورسوله، وإني لا أعلم غدراً أعظم من أن يبايع رجل على بيع الله ورسوله ثم ينصب له القتال، وإني لا أعلم أحداً منكم خلعه، ولا تابع في هذا الأمر، إلا كانت الفيصل بيني وبينه."

[کاتێ خەڵکی مەدینە بەیعەتیان لە یەزید هەڵوەشاندەوە، ئیبن عومەر منداڵ و کەس و کاری کۆکردەوە، و گووتی: « گوێم لە پێغەمبەر و گووتی: هەر غەدداریێک ئاڵایەکی بۆ هەڵدەدرێت لە ڕۆژی قیامەت" ئێمە بەیعەتمان بەو پیاوە [یەزید] دا لەسەر دەستی خوا و پێغەمبەر، من لەو غەدرە گەورەتر نازانم، یەکێک

بەیعەتی دابێتە کەسێک لەسەر دەستی خوا و پێغەمبەر، ئینجا جاڕی جەنگبدات لە دژی! وە من بەس بزانم یەکیک لە ئێوە بەیعەت هەڵدەوەشێنێتەوە، یان بەدوای ئەو فتنە و کێشەیە بکەویت، ئەو کارەی دەبێتە جیابوونەوەی نیوان من و ئەو»
ئەو هەڵوێستانەی وەک دامەزرێنەرێکی گەورەی کۆڵەکەی حەنبەلیزم ومەدخەلیزم دەریدەخات، کاتێ شەرعیەتیان دایە هەر کەسێکی خاوەن هێز بەهێز خۆی بسەپێنێت بەسەر خەلافەت! و کردیانە پایەیەک ئەوەی زۆرترین هێزی پێ بێت، با بێ بەهاترین و ناشیاوترین وبێ نرخترین کەسیش بێت، کە بتوانێت دەسەڵات بگرێتە دەست، دەبێتە خەلیفەی شەرعی.
هەتا کە بەیعەتی بە زۆر پێدرا بۆ یەزیدی کوڕی معاویە، کاتێ لەبەر خراپی یەزید خەڵک لێی ڕاپەڕین، ئیبن عومەر، لە جیاتی هاندانی خەڵک یان بێ دەنگ بوونی، خەریکی سەردانی ئەم و ئەو بوو بە توونەدی داوای پەشیمانبوونەوەی لێدەکردن لە هەڵوەشاندنەوەی بەیعەتی یەزید، زۆر بە توونەدی ڕەخنەی لە عبدالله ی کوڕی زوبێریش گرت!
دەیگووت شەڕی ئیبن زوبێر لە پێناو دنیایە و مولکە و دەیگووت عبدالله کوڕی زوبێر و شوێن کەوتوانی ستەمکارن (بغاة) و هیوای خواست لەگەڵیان بجەنگێت لەبەر ستەمیان لە بەنی ئومەیە!!! لە ڕیوایەتێکدا دەڵێت: ئەو بەیعەتە کخەیە، وەک چۆن منالی بچوک پیسایی دەکات و دەس دەخاتە ناو پیسایییەکەی، دایکی دەڵێت کخەیە! بەیعەتی ابن الزبیر وەک ئەوە کخەیە وایە!
کە عبدالملک کوڕی مەروان بوە خەلیفە زوو زوو نامەی نارد گووتی: بەیعەتی خۆم کوڕەکانم دەدەم بە ئەمیری موئمنین عبدالملک کوڕی مەروان بە گوێڕایەڵی و لەسەر سونەتی خوا و سونەتی پێغەمبەر، لەوەی توانام بەسەردا شکا، و کوڕەکانیشم دانیان بەو بەیعەتە هێنا.
عن عبد الله بن دينار ، قال : لما اجتمعوا على عبد الملك كتب إليه ابن عمر : أما بعد : فإني قد بايعت لعبد الله عبد الملك أمير المؤمنين بالسمع والطاعة على سنة الله وسنة رسوله فيما استطعت وإن بني قد أقروا بذلك .

## ٢

## ئیبن عومەر
## تەقوا و شوێن کەوتنێکی نا عەقڵانی سونەت!

سەرەڕای ئەو هەموو ستایشکردنەی ئیبن عومەر، گوایە زۆر بە تەقوا و لەخواترس بووە، بەڵام زۆر ئاماژەهەن کە چەمکی بەتەقوایی و لە خواترسان لای ئەو بەتەواوی جیاوازە لەوەی لە بیری خەڵکدا هەیە بۆ تەقوا و لە خواترسی! تەقوا ئەوەیە لە شەهوات وچڵێسی سێکسی دوور بیت نەک هەزارەها کەنیزەت هەبێت! یان لە کوێی تەقوا جێگای دەبێتەوە، بچیتە بازاڕی کۆیلایەتی ئافرەتی کۆیله بکڕیت وەک هەر کوتاڵێک بیپشکنیت، و دەست لە جەستەی بدەیت، و دەست بخەیتە سەر سمتی و ناو مەمکەکانی، و جلی لەسەر قاچەکانی هەڵدەیتەوە، تا بزانی جەستەیەکی سێکسی و جوانی هەیە بۆ کڕین وشەهوەتبازی یان نا!
ئەو عبدالله ی کوڕی عومەرە سەدەها کۆیلەی هەبوو دەیانیکڕی و دەیفرۆشتنەوە، وجاروبارێکیش کە لە هەندێکیان بێزار دەبوو دەیفرۆشتەوە و هەندێکیشی ئازاد دەکرد لە پێناو خوا!
دەڵێن تا مرد زیاتر لە هەزار کۆیلەی ئازاد کردوە، ئەگەر ئەوە ڕاست بێت، دەبێت ژمارەی کۆیلەکانی چەند بووبن؟! ئینجا لە چەند ڕیوایەتێک وەک پسپۆڕێک لە کڕینی کۆیلەی ئافرەت و ناسینەوەی جەستەی لەبار دەردەکەوێت، و دەڵێت دەستی دەخستە سەر سمت و سینگی کەنیزەکان، بۆ پشکنینی پێش کڕینی!
تەقوا لەوە دەردەکەوێت کە چاوت لە دەستی ستەمکاران نەبێت، پارەت بدەنێ تا دەمت داخەن! کەچی معاویە سەدان هەزار دیناری بۆ ئیبن عومەر دەنارد، بۆدەم داخستنی و بەیعەتدانی بە یەزیدی کوڕی، و تا پێشبڕکێ لەگەڵ یەزیدی کوڕی نەکات لەسەر خەلافەت. هەتا مختار الثقفي یش کە دژی دەوڵەتی ئومەوی بوو، خاریجی بوو، کاتێ پارەیەکی زۆری بۆ نارد قبوڵی کرد، و دەیگووت من داوا ناکەم لە کەس، بەڵام هەر کەسێ پارەم بۆ بنێرێت ڕەتی ناکەمەوە!
لەو خاڵەشدا پێشینەیەکی بۆ زانا سەلەفیەکان دامەزراندوە، کە هەردەم چاویان لە دەستی خەلیفە و سوڵتان بێت، نەک وەک ئەبو حەنیفە خەریکی بازرگانی بن! وەرگرتنی پارە لە خەلیفە و دوژمنی سیاسی خەلیفە، یانی سەلەفیەکان دەتوانن

پارە لە حاکمی شەرعی و خەواریجێکی هەڵگەڕاوەش لە ولی الامر وەرگرن لە یەک کاتدا!
نازانم ئەو تەقوا و وەرەعە ئەگەر لە خۆشیەکانی دنیا و بە تایبەت لە مەسەلەی پارە و مەسەلەی سێکس خۆی نەدۆزێتەوە، لە چیدا دەردەکەوێت؟!
ئینجا زۆر باسی زانایی عبداللە ی کوڕی عومەر دەکەن، بەڵام کە دەچیتە سەرژیانی دەبینیت وانییە، هەتا دەڵێن کە بە عومەر دەڵێن، کوڕەکەت دەستنیشان بکە بۆ خەلافەت، دەڵێت: چۆن کەسێک دەستنیشان دەکەم بۆ کارێکی وا گەورە، لە کاتێکدا نازانێت ژن تەلاقدان چۆنە! ئاماژە دەکات بۆ تەلاقدانی ژنێکی بە هەڵە، کە پێغەمبەریش لێی تورە بوو لەسەری!
ئینجا لە حەدیسیش دایکی موسڵمانان عائشەی ڕەخنەی لە گێڕانەوەی چەندین حەدیسی ئیبن عومەر گرتووە و بۆی ڕاست کردۆتەوە.
شوێن کەوتنێکی نا عەقڵانی سونەت!
ئیبن عومەر سیفەتێک جیای دەکردەوە، لە هەموو هاوەڵانیتری پێغەمبەر، ئەویش شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوەی پێغەمبەر بوو، لە ورد و درشتی کاروکردەوەکانی، تا ڕادەی ئەوەی ترس هەبوو لە عەقڵ لە دەستدانی!
ئەوەش وەک زانراوە پرنسیپێکی زۆر زەقی سەلەفییەتی کۆن و نوێیە، دەڵێن لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر نابێت بڵێی بۆ و لەبەرچی و چۆن!؟ بەڵکو دەبێت بە متمانەوە لاسایی پێغەمبەر بکەیتەوە لە هەموو شتێک، هەتا ئەگەر عەقڵیشت پێی قبول نەکرا! دەبێت عەقڵت لێرا بهێنیت متمانە بە ڕیوایاتی پیرۆزی ئیسلام بکات، چونکە نەقل گرنگترە لە عەقڵێکی فانی!
ئیبن عومەر لە هەموو ئەسحابەکان زیاتر دوای سونەت و کارەکانی پێغەمبەر دەکەوت، بە جۆرێک سنوری عەقڵیشی تێپەڕ دەدا. بۆ نمونە کاتێک پێغەمبەر لە دەروازەی مەککە وشترەکەی خۆنەویستانە دوو جار خولایەوە، ئیبن عومەر هەر جارێ دەگەیشتە ئەو شوێنە وشترەکەی دوو جار دەخولاندەوە، بێ ئەوەی ئەو کارەی هیچ حیکمەتێکی تێدا بێت!
یان کاتێ پێغەمبەری دیت لە ژێر دارێکدا پشووی دا و حەسایەوە، ئەویش تا مرد گەیشتبا ئەو دارە پشوێکی لە ژێر دەدا! بەردەوام دارەکەیشی ئاو دەدا تا وشک نەبێت، نەوەک سونەتەکەی لە کیس بچێت!
نافع دەڵێت: ئەگەر بڕوانیتە شوێنکەوتنی ئیبن عومەر بۆ پێغەمبەر دەڵێیت: ئەو

پیاوە شێتە! "عن نافع، قال : لو نظرت إلى ابن عمر إذا اتبع رسول الله – صلى الله عليه وسلم – لقلت : هذا مجنون . "
هەروەها وەک لێی دەگێڕنەوە" کە ئیبن عومەر هێندەی دوای فەرمایشتی پێغەمبەر و سونەت و ئەحواڵی دەکەوت، وهێندەی بایەخ پێدەدا، هەتا ترسی لە دەستدانی عەقڵیان لێی دەکرد لەبەر ئەو هەموو بایەخە بێ سنوورە! " ئەوەش خاڵێکی گەورە و دیاری قوتابخانە سەلەفیەکانە، کە پێموابێت ئیبن عومەر پێشەنگیانە لە شێوازی شوێنکەوتن و لاسایی کردنەوەی ناعەقڵانەی بۆ کار وکردەوەکانی پێغەمبەر!
"ابن وهب : عن مالك ، عمن حدثه، أن ابن عمر كان يتبع أمر رسول الله – صلى الله عليه وسلم – وآثاره وحاله ويهتم به، حتى كان قد خيف على عقله من اهتمامه بذلك ."

## ئیبن عومەر و حەزی ئافرەت!
## ٣

وەک زانیتان کە ئیبن عومەر بەشێوەیەکی زۆر نامۆ شوێنی هەموو ئاکار وجوڵانە و ڕەوشتێکی پیغەمبەر دەکەوت، تا ڕادەی ئەوەی ترساون عەقڵی لە دەست بدات، لەبەر وەسوەسەی قەهری شوێنکەوتنی ولاسایی کردنەوەی هەموو جموجۆڵێکی پێغەمبەر، هەتا جوڵە خۆنەویست ولا ئیرادیەکانیشی، وەک خولانەوەی حوشترەکە و دانیشتن لە ژێر دارەکە بۆ حەسانەوە!
لەوە دەچێت مەسەلەی حەزیشی لە ژن، وا بۆی چوو بێت کە ئەوەش هەر جۆرێک بێت لە سونەت پەیڕەوکردن، چونکە ئەو خوشکی ژنی پێغەمبەر بووە، و بە بەرچاوی خۆی ئەو هەموو زەواجەی پێغەمبەری دیتووە، و ئەو هەموو قسەیەی پێغەمبەری گوێ لێبووە دەربارەی حەزی لە ئافرەت، بۆ نمونە کە دەڵێت: " لە دنیادا دوو شتم بۆ شیرین کراوە: بۆنی خۆش و ژن! حبب الي من دنياكم الطيب و النساء....
ئەگەر ئەو لە ملسوڕاندنەوەی حوشترێک وا پەیڕەوی پێغەمبەر بکات، چۆن لە سیفەتێکی کەسی و کۆمەڵایەتی وا گرنگ شوێنی ناکەوێت؟!

مـن نالێـم پاڵنـەری خودیشـی نەبووە، دەکرێت خۆشـی ئـەو زەوق و حـەزەی زۆر بەهێـز بـوو بێـت، بـەڵام زنجیـرەی ژن هێنانەکانـی پێغەمبـەر و کەنیزەکانیشـی، حەدیسـەکان و ئایەتەکانیـش، و واتـە کـۆی ژیانـی کۆمەڵایەتـی پێغەمبـەر، پاڵنـەرە هـەرە بەهێزەکە بووە لای، کە ئەو حـەزە نـەک سـەرکوت نـەکات، بەڵکوو برەویشـی پـێ بـدات وەک فەزیڵەیـەک، تـاڕادەی ئـەوەی بەربانـگ بـە سـێکس بکاتـەوە!

من دڵنیـام ئەگـەر پێغەمبـەر وەک مەسـیح ژنـی نەهێنابـا، یـان هـەر ژنێکـی هێنـا، ئیبـن عومەریـش یـان ژنـی نەدەهێنـا یانیـش هـەر دانەیەکـی دەهێنـا، نـەک چەندیـن ژن و سـەدان جاریـەی هەبێـت! ئەخـر دەڵێـن تـا مـرد هـەزار کۆیلـەی ژن و پیـاوی ئـازاد کـردوە، وەک ستایشـیش دەیگێڕنـەوە، ناڵێـن هـەزاراران کۆیلـەی لـە کـوێ بـوو، بـە چـی پێکـرا ئـەو پیـاوە زاهیـدە؟!

هـەر ئیبـن عومـەر خۆشـی دان بـەو هێـزە سێکسـیە نامۆیـەی خـۆی دەهێنێـت، دەربـارەی هێـزی سێکسـی خـۆی دەڵێـت:

هێزێکی زایندەیی سێکسیم دراوەتێ، نەمزانیوە بە کەس درابێت جگە لە پێغەمبەر!

السـري بـن يحيـى : عن زيـد بـن أسـلم ، عن مجاهـد ، قـال : قال ابـن عمـر : لقـد أعطيت مـن الجمـاع شـيئا مـا أعلـم أحدا أعطيـه إلا أن يكـون رسـول اللـه صلـى اللـه عليـه وسـلم .

دەگوترێت: ئیبـن عومـەر یەکـەم. شـت کـە ڕۆژووی پـێ دەشـکاند جیمـاع و سـێکس بـوو!

یانـی لـە جیاتـی ئـاو و خورمـا، بـە سـێکس ڕۆژووی دەشـکاند، نازانـم ئـەوەش سـونەتێک بـووە ئـەو پێـی زانیـوە، یـان لـە سـونەت لایـداوە!

قـال الطبراني في المعجـم الكبيـر ٢٦٩/١٢ :١٣٠٨٠ عـن محمـد بـن سـيرين قـال ربمـا أفطـر ابـن عمـر علـى الجمـاع .

ئینجـا زانـراوە کـە پێغەمبـەر بـە گەنجانـی وتـووە: ئـەوەی ناتوانێـت ژن بهێنێـت، بـا بـە ڕۆژوو بێـت! چونکـە ڕۆژوو هێـزی شـەهوەت دەشـکێنێ، بـەس لێرە ئیبـن عومـەر نـەک هـەر شـەهوەتی نەشـکاوە، بەڵکـو خەریکـە لێـی دەتەقێتـەوە، بەربانگـی پـێ دەکاتـەوە! نازانـم چـۆن فریـای جیمـاع و خـواردن وخواردنـەوە و خۆشـتن و نوێـژی بـە جەماعەتیـش کەوتـووە!

العيني لـە عمدة القاري ٦٦/١١ :وەک هەمیشـە بـەدوای عوزرهێنانـەوە دەگەڕێت بـۆ ئـەو کارەی ئیبـن عومـەر و دەڵێـت:

ئەو کارەی ئیبن عومەر دوو ئەگەری تێدایە:
یەکەم لەبەر زاڵبوونی شەهوەتە، هەرچەندە ڕۆژووگرتن شەهوەت دەشکێنێت!
دووەمیش چونکە دڵنیایە لە حەڵالیەتی ژنەکەی، لەوانەیە دوو دڵ بێت لە خواردنەکانی! یانی لە حەڵاڵیەتی خواردنەکانی!
وروينا عن ابن عمر أنه كان ربما أفطر على الجماع رواه الطبراني من رواية محمد ابن سيرين عنه وإسناده حسن وذلك يحتمل أمرين : أحدهما أن يكون ذلك لغلبة الشهوة وإن كان الصوم يكسر الشهوة والثاني أن يكون لتحقق الحل من أهله وربما يتردد في بعض المأكولات!
أخبرني سالم، عن ابن عمر ، قال : إني لأظن قسم لي منه ما لم يقسم لأحد إلا للنبي – صلى الله عليه وسلم – وقيل : كان ابن عمر يفطر أول شيء على الوطء .
هەر لەبەر ئەو هێزە سێکسیە زەبەلاحەی زۆر خەریکی کڕینی کۆیلە و کەنیزەک بووە، ڕیوایەتەکە کە ئەلبانی تەسحیحی کردوە دەڵێت: کاتێ کەنیزەیەکی دەکڕی دەستی دەخستە نێو مەمکانیان و نێو ڕانەکانی، نێوانی سمتی، و سەر سمتیان لەسەر جلەکانیانەوە، و قاچەکانیانی ڕووت دەردەخستن! سینگی پاڵ دەنا، بۆ پشکنینی کەل و پەلەکانی!
"أن ابن عمر كان يضع يده بين ثدييها ( يعنى الجارية ) و على عجزها من فوق الثياب و يكشف عن ساقها " .
الراوي: نافع مولى ابن عمر . خلاصة الدرجة: صحيح . المحدث: الألباني . المصدر: إرواء الغليل . الصفحة أو الرقم: ١٧٩٢

## ٤

هەر ئیبن عومەر دەگێڕێتەوە، دەڵێت ئەو ئایەتەم هات بە خەیاڵدا [لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون] واتە خێرتان گیر ناکەوێت تا ئەوەی لاتان خۆشەویستە نەیبەخشن. بیرم لەو هەموو نیعمەتانە کردوە کە خوا پێی بەخشیوم، هیچم خۆشەویستتر لە کەنیزەکەم رمینة، ڕومەینە نەدۆزیەوە! گووتم: ئەوە ئازادم کرد لە ڕاهی خوا، چونکە قەت لە قسە و گفتدان بە خوا پەشیمان نابمەوە، دەنا بەتەمابووم بیکەمە هاوسەری خۆم، ئینجا بەخشییە نافعی کۆیلە و قوتابی خۆی، مناڵێکی لێی بوو. هەر جارەی مناڵەکەی ماچ دەکرد و دەیگووت: وای لە بۆنی

ڕومەینە! ابن خلكان ١:٣١٠، الاصابة ٢:٣٤٩
قال نافع : لقد رأيت عبد الله بن عمر يأخذ ذلك الصبي فيقبله ثم يقول: واها لريح فلانة، يعني الجارية التي أعتق!
یانی هەر نافع خۆی گێڕەڕەوەی ئەو ڕوداوەیە، و لەبەرچاوی نافعی کۆنە کۆیلەی باسی حەز وئارەزووی سێکسی، و بۆنی خۆشی ژنەکەی دەکات، نافعیش چونکە کۆیلەی بوو، دەبێت بێ دەنگ بێت، دەنا ئەو قسەیە لەناو عەرەب و لەناو کوردیش پیاوی لەسەر دەکوژرێت!

## دەڵاڵی کەنیزە کڕین!

ئیبن عومەر لە مەسایلی پشکنینی کۆیلەی ئافرەت و لێزانینی هێندە کارامە بوو، وەک چۆن خەڵک بیەوێت ئوتۆمبیلێکی بێ عەیب بکڕێت، کەسێکی شارەزای نهێنیەکانی ئۆتۆمبیل لەگەڵ خۆی دەبا، ئەو هەر خۆبەخشانە کە بەلای بازاڕی کۆیلەداری تێپەڕیبا، دەچوو ئافرەتە کۆیلەکانی بۆ دەپشکنین، واتە دەستی دەخستە نێو مەمکانیانیان و ڕایدەوەشاند وەک شەقشەقەی، ئینجا دەستی دەخستە سەر سمتی، یانی پاشەڵی بە کوردی، و ئینجا قاچەکانی تا ڕانیان ڕووت دەکرد تا کاڵایەکی باشیان بۆ بکڕێت!
عبد الرزاق عن بن عيينة عن عمرو بن دينار عن مجاهد قال كنت مع بن عمر في السوق فأبصر بجارية تباع فكشف عن ساقها وصك في صدرها وقال اشتروا يريهم أنه لا بأس بذلك / مصنف عبدالرزاق...موجاهید دەڵێت لەگەڵ ئیبن عومەر بووم لە بازاڕ، دیتی کەنیزەیەک دەفرۆشرێت، قاچی ڕووت کردەوە و سینگی پاڵنا [بۆ ئەوەی بزانێت وەزعی مەمکەکانی چۆنە!] گووتی: ئاوی لێ مەخۆنەوە بیکڕن، نیشانیان دەدات بێ عەیبە!
هەر لە ڕیوایەتێکی تر دەگێڕێتەوە: موجاهید دەڵێت لەگەڵ ئیبن عومەر بووم لە بازاڕ، دیتی کەنیزەیەک دەفرۆشرێت و بازرگانانی کۆیلە لەسەر کۆبوونەتەوە، کە ئیبن عومەریان دیت، بڵاوەیان کرد و گووتیان: ئیبن عومەر هات [یانی زۆر ناودار بووە لەو کارە دیارە!] ئیبن عومەر لێی نزیک کەوتەوە، دەستی لە چەند بەشێکی جەستەی دا، وگووتی: کوا خاوەنی ئەو کەنیزەیە، ئەوە کاڵایە.

عن مجاهد قال : كنت مع ابن عمر أمشي في السوق فإذا نحن بناس من النخاسين قد اجتمعوا على جارية يقلبونها، فلما رأوا ابن عمر تنحوا وقالوا : ابن عمر قد جاء، فدنا منها ابن عمر فلمس شيئا من جسدها قال : أين أصحاب هذه الجارية، إنما هي سلعة .

لە ڕیوایەتی دووەم دەڵێت: کە دیتیان ئیبن عومەر هات، بۆیان چۆڵ کرد یەکسەر جلەکانی لەسەر قاچەکانی لادا، و سنگی پاڵدا [بزانی وەک سپرینگە یان نا!] گووتی: بیکڕن. لە خەبەرێکیتردا هەر موجاهیدی قوتابی خۆی دەڵێت دەستی خستە نێو مەمکانی شەقشەقەی پێکرد ئینجا دەیجوڵاندەوە! کە پسپۆر بووە بڕارۆ!

عن مجاهد قال مر ابن عمر على قوم يبتاعون جارية فلما رأوه وهم يقلبونها أمسكوا عن ذلك فجاءهم ابن عمر فكشف عن ساقها !! ثم دفع في صدرها وقال اشتروا، قال معمر وأخبرني ابن أبي نجيح عن مجاهد قال وضع ابن عمر يده بين ثدييها ثم هزها!!

عن عبيد الله عن نافع عن ابن عمر أنه كان إذا أراد أن يشتري الجارية وضع يده على أليتيها أو بين فخذها وربما كشف عن ساقيها !!

«ئیبن عومەر ئەگەر ویستبای کەنیزەیەک بکڕێت دەستی دەخستە نێوان سمتی یان نێوان ڕانەکانی، لەوانەش بوو قاچەکانیشی ڕووت دەکردن!"

لە ڕیوایەتێکیتر نافع هەر لە مصنف عبدالرزاق دەگێڕێتەوە: کە پشت و زگ و قاچەکانی ڕووت دەکرد، و دەستی دەخستە سەر سمتی!

عن ابن جريج عن نافع أن ابن عمر كان يكشف عن ظهرها وبطنها وساقها ويضع يده على عجزها!!

کەس نەڵێت ئەو ڕیوایەتانە لاوازن، چونکە یەکەم لەلایەن موحەدیسێکی زۆر تەسحیح کراون، دووەم ئەو حەدیسانە ئەگەر لاوازیش بن، تازە لە یادەوەری ئیسلامی تۆمار بوون، و ملیۆنەها کەس باوەڕیان پێیە، و فۆرمەڵەی عەقڵیەتی کردوون، ڕزگار بوون لە ژێر کاریگەری ئەو حەدیسانە، کە کەسانێک لەبەر خاتری ئیمانیان ڕەتی دەکەنەوە، موعجیزەیەکە هێنانە دی زۆر گرانە یان نامومکینە.

دووەم: من زۆرم خوێندەوە لەسەر ئەو بابەتە، هەزاران بروبیانووی بۆ دەهێننەوە، بۆ نمونە لە سایتێکی ئیسلامی بەناوبانگ وەک الالوکة، دەربارەی ئیبن عومەر وجاریەکڕین و پشکنین دەڵێت: " گەورەترین هەڵە ئەوەیە کە کەسانیک ئەو حەدیسانە دەبیستن کە دەوروژێنرێن، ئەگەر سەنەدێکی گێڕانەوەی حەدیسەکە

لاواز بوو، مانای وانییە هەمووی زەعیفە! هەیە دەڵێت جیهادی الطلب، یانی بەبێ هۆ هێرش کردنە سەر خاکی کافران، بۆ بلاوکردنەوەی ئیسلام، لە ئیسلامدا نییە! ئەوەی دەڵێت ئیسلام بڵاونەبۆتەوە بە شمشێر، ئەوە ساویلکەیە، نازانێت لەیەکەم ڕۆژی ئیسلامەوە، تا کۆتایی خەلافەتی عوسمانی جیهادی دەستپێشخەر یانی ابتداء هەبووە وهەر دەبێت!

دەڵێت: " هۆکارەکەی ئەوەیە ئەو بانگخوازە، لە ژێر کاریگەری فەلسەفەی خۆرئاوایی نەسرانی عەلمانیدایە! کە دەڵێت شەڕ و جەنگ دەست پێکردن بێ هۆ، تاوانێکی ڕەوشتیی گەورەیە هەر پاکانەیەکیش بکات، و هاوژیانی ئاشتیانەی ڕەها و خۆشەویستی [مرۆڤایەتی] ڕەها، لەگەڵ ئازادی فیکر و گوزارش کردن، لە چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤ، ئەرکی ئەو سەردەمەیە و واجیبە، بەڵکو کوشتنی [مرۆڤ] بە رەهایی کارێکی نا ڕەوشتی خراپە!!

"السبب أن هذا الداعية متأثر - تأثرا خفيا - بفكر فلسفي غربي نصراني-علماني الأصل، صار يُبث في زماننا هذا في قلوب الناس في كل مكان – بما في ذلك بلاد المسلمين - فكر مفاده أن القتال والحرب من حيث المبدأ فساد وجريمة أخلاقية كبرى أيا ما كان مبررها، وأن التعايش السلمي المطلق والمحبة "الإنسانية" المطلقة مع حرية الفكر والتعبير المطلقة في إطار ما يجعلونه هم من "حقوق الإنسان" فريضة هذا الزمان وواجب هذا الوقت الذي نحن فيه، بل وأن مطلق القتل نفسه (قتل النفس) عمل لا أخلاقي مذموم!!"

یانی گاڵتەی بە بەو قسانە دێت کە نابێت بێ هۆ جەنگ بەرپا کەیت، یانی گاڵتەی بە خۆشەویستی مرۆڤایەتی دێت، یانی فشەی بە تاوان دانانی کوشتن دێت!

لە کۆتاییدا زۆر بە متمانەوە دەڵێت: ئەو حەدیسانەی لەلایەن ئیبن عومەرەوە هاتوون دەربارەی کەنیزەک کڕین و پشکنین، زۆربەی هەرە زۆریان ڕاستن بە کوێرایی ئەوانەی کەوتونەتە ژێر کاریگەری عەلمانیەت و فەلسەفەی ڕۆژئاوا!

# وێنەی ئافرەت لای حەزرەتی عەلی بەپێی دەقە شیعەکان!

## ١

هەموو شارەزایەک دەزانێت، کە بزاڤی رەخنەیی دینی لەناو چوارچێوەی مەزهەبی شیعیدا زۆر لاوازە، زۆر جاران وا هەست دەکەیت کە هاوپەیمانیەتێک هەیە، لە نێوان هەموو چین وتوێژەکانی کۆمەڵگا شیعیەکان، بۆ بەرز راگرتنی بەڵگەنەویست و ڕاستیە مەزهەبیەکان، ودەرنەچوون لیی بەهەر نرخیک.
هەر بۆیەش دەبینین زۆر لە رۆشنبیرانی شیعە، حەزێکی نیمچە نەخۆشیان هەیە بە ڕەخنەگرتن لە خەڵکانی تری مەزهەبەکانی تر وەک وەهابیەکان بە تایبەتی، وئەهلی سونە بە گشتی. ئەو حەزە میزاجیە مەزهەبیە، لە ژێر کاریگەری فەرهەنگی و مادی زۆر لە ڕۆشنبیر و موتەشەیعەکانی بەناو سونەش پیادەی دەکەن.، من خۆم کە هەزاران ڕەخنە دەگرم لە سەلەفیەت، کەسانێکی کوردی موتەشەیع پێیان خۆشە و دەستخۆشیم لێدەکەن، بەڵام کە ڕۆژێک رەخنەیەک بگرم لە تێڕوانینێکی یان هەر شتێکی شیعە، چەندین موتەشەیعی کورد لیم توورە دەبن، نازانن چۆن وەڵامم بدەنەوە!
سەیر لەوەدایە ئەوەی ئەوان پێی دلخۆش دەبن و رەخنەی لێدەگرن لە دژی سونە، هەمان ئەو شتانە زۆرجار بە زیادەوەش لەناو دەقە مەزهەبیە بێ شومارەکانی سەرچاوە شیعیەکان هەیە بەزیادەوەش. بەڵکو گومانم نیە ئەگەر چەند دەقێک لە سەرچاوە شیعیەکان وەرگرین وبڵێین ئەو دەقانە لە بوخاری هاتوە یان موسلیم، تا ماندوو دەبێت پێی دڵخۆش دەبیت وگالتەی پێ دێت، بەڵام هەر کە وتت سەرچاوەی ئەو دەقانە شیعین، بزانە چۆن لە جەڵتە نزیک دەکەوێتەوە!
هۆی سەرەکی نەبوونی بزاڤتی ڕەخنەی ناوەکی باڵادەستی عەقلیەتی دەقگەرایە لە کۆمەڵگای شیعیدا کە دژی رەخنە دەجەنگێت، وادەزانێت بەو شێوەیە دەتوانێت بوونی خۆی بپارێزێت، کەچی لە ڕاستیدا تەنها پارێزگاری لە دواکەوتوویی خۆی دەکات. تلانەوەی ئافرەتیش بەدەست کۆمەڵگایەک تێیدا عەقڵیەتی دەقگەرا باڵا دەست بێت، تەنها رووێکە لە رووە پڕ کێشە وئازارەکانی کۆمەڵگا دینیە بەرێوە چووەکان بەو عەقڵیەتە دەقگەرایە.

هۆیەکی تری نەبوونی ڕەخنەی ناوخۆیی جیدی، ئەوەیە کە ڕەخنەی ناوخۆیی پێویستی بە ژینگەیەکی هێمن ودوور لە کێشمەکێش هەیە، کە رەخنەگر هیچ مەترسیەک نەبینێت لە پرۆسێسی رەخنەگرتن، ببێتە هۆی هەڕەشەی بوونی وجودی. ئەو ژینگەیەش بوونی نیە لە کۆمەڵگا شیعیەکان، لەبەر بەردەوامی خەریک بوون بە شەڕی شیعە وسونەدا.

## شیعە و سونە هەمان تێڕوانین بۆ ئافرەت!

من هیچ جیاوازیەک نابینم لە نێوان تێڕوانین و کۆی جیهانبینی شیعە و سوونە بۆ ئافرەت، کە لە هەردوو ترادیسیۆن مەحکومی دەقن، سەرەڕای داب ونەریتێکی دێرینی نادۆست بە ئافرەت. ئافرەت لەلایەن ئەو جۆرە عەقڵیەتە دەقگەرایانە، بە سونە و شیعەوە هەردەم دەڵێن ئیسلام ڕیزی لە ئافرەت ناوە وزۆری بەرز ڕاگرتوە، بەڵام ئەوە ناڵێن بۆ بەرگری کردن لە مافی ئافرەتان، بەلکو بۆ بەرگری کردن لە دەقەکانیان، ئەو شتانەیان تەنها کردۆتە دروشم، بەڵام کاتێک دەڕوانیتە واقیعی حاڵی ئافرەت لەو کۆمەڵگایە دینیانە، دەبینیت واقعێکی دواکەوتوو مەحکومە بە تێڕواننێکی نێگەتیڤ بۆ ئافرەت، بۆیە دەبێت ڕەخنە لەو عەقڵیەتە دەقگەرایە بگیرێت کە ئەو بارە نیگەتیڤەی بەرهەم هیناوە، پێویستە هەوڵدەین ئافرەت داماڵین لە هەندێک لەو کۆت وبەندانە.

وەک دەزانین شیعە چ تێڕوانینێکی هەیە بۆ حەزرەتی عەلی، وەک ئیمامی یەکەمی مەعسوم لە هەڵە و گوناهـ و وەک دامەزرێنەری یەکەمی شیعەگەرایی، زۆرجار ئەو خەملاندنە دەگاتە ئاستی نەک بە پێغەمبەرکردنی، بەڵکو تەئلیهو خوادەوەند کردن! کەوابوو ڕای حەزرەتی عەلی دەربارەی ئافرەت یانی ڕای تێکڕای مەزهەبی شیعی لەو بارەیەوە.

چونکە عەلی یش کوڕی هەمان ئەو ژینگەیە بووە، کە حەزرەتی عومەر وئەبوبەکر و ابو هریرة و عەبدوڵلای کوڕی عومەری لێ پەروەردە بوە، هەمان تێڕوانینی باوی هەبووە بە ئافرەت، ئەگەر دەقەکان بەڕاستی لەوەوە دەرچووبن.

# پایەی نهج البلاغة

هەمووومـان دەزانیـن کـە مەنزیلـە وپایـەی کتێبـی نهـج البلاغـة لای شـیعەکان، وەک پایـەی تەلمـودە لای جولەکـەکان، تـا ئێسـتا ٣٧٠ کتێبـی لەسـەر نووسـراوە لـە نێوان شـرۆڤە و لێکدانـەوە و تەفسـیر و وەرگێـڕان!

بـەڵام هێشـتا زاناگەلێکی ئەهلی سـونە بـە هەڵبەسـتراوی دەزانـن وەک ئیبـن تەیمیـە و زەهەبی وزۆرانـی تریش، بـەڵام بـە دیوەکـەی تـرەوە زانایانـی شیعە هێنـدە تەقدیسـی دەکـەن، و دەڵێـن لـە پـاش قورئـان و حەدیسـی پێغەمبـەر دێت! هـەر بۆیـە سـەرەڕای بوونـی فەرمودەگەلێکـی زۆری حەزرەتـی عەلـی، کـە هەڵگری نێگەتیڤترین تێروانین وبۆچوونـە دەربـارەی ئافـرەت، گوێـت لـە زانایەکـی دینـی شـیعی نابێـت نکوڵـی لـە هەقیقەتـی ئـەو قسـانە بکـەن، بـە نسـبەت دەرچوونـی لـە حەزرەتـی عەلیـەوە. بەڵکو پینـە وپـەڕۆ و تەئویلاتـی سـەیر سـەیری بـۆ دەکـەن، وەک پیشـەی هەمیشـەیی هـەر دەقگەرایـەک، کـە زۆرجـار ئافرەتـان قەرزاریـش دەبنـەوە، گوایـە ئـەو قسـە نێگەتیڤانـە هەمـووی پۆزەتیڤـن، بـەڵام ئـەوان لێـی ناگـەن!

بۆیـە شـێخ عەلـی کورانـی شـیعیش، بـۆ دەربازبـوون لـەو قسـە پڕ سـووکایەتیانە بـۆ ئافـرەت، دەڵێـت ئـەو هەمـوو رەخنـە و زەمـەی ئافـرەت کـە لـە نهـج البلاغـەدا هاتـوە دژی ئافـرەت، مەبەسـت لـە عائشـەیە، نـەک هەمـوو ئافرەتێـک؟!

https://www.youtube.com/watch?v=p_U٨LfPOYcN&hd=١

بـەڵام ئـەو قسـەیە خـۆی ناگرێـت لەبەرامبـەر ئـەو فەرمودانـەی کـە هاتـوون، و گشـتگیریەکی ڕەهـای تێدایـە دەربـارەی سـەرکۆنەکردنی ئافـرەت، وسـوکایەتی پێکردنـی و بـە نـزم سـەیر کردنـی. زانایەکیتـر کـە لێـی دەپرسـن بـۆ حەزرەتـی عەلـی وا زەمـی ئافرەتـی کـردوە، سـەد شـێر وڕێـوی دەهێنێتـەوە بـۆ پاکانـە کـردن بـۆ قسـەکانی عەلـی، بـەڵام بێ سـوودە، چونکـە دەقـەکان لـە توانـای کەسـدا نییـە تەئویلـی بـۆ بـکات یـان بیشـارێتەوە.

بـەڵام هەندێکیتـر لـە زانایانـی شـیعە بـە بوێـری و ئاشـکرایەوە دەڵێـن مەبەسـتی هەمـوو ژنێکـە کـە زۆربەیـان زەمکـراون.

خوئـی دەڵێـت: « ئـەو هەواڵانـەی هاتـوە لـە بـارەی زەمکردنـی ئافرەتـان بـە ڕەهایـی، لەسـەر زۆربـەی هـەرە زۆریـان جێبەجێ دەبێـت، دەنـا ئافرەتانێـک هـەن کـە لـە نـاو

پیاوانیش وەک ئـەوان زاهیـد و پرهێزکار وبەتەقـوا کەمـن.»
الشـيـخ الميـرزا حبيـب الهاشـمي الخوئـي: منهـاج البراعـة فـي شـرح نهـج البلاغـة، ج ٥.
ص ٣١٣.
کەوابـوو ئـەوان پێیـان وایـە، ئـەو قسـانەی عەلـی دەربـارەی ئافـرەت فەرمووبەتـی،
لەبـەر ئـەوە کێشـە و شـەڕە نیـە کـە ڕوویـدا لـە نێـوان ئیمـام وعائیشـە، و تایبـەت نیـە
بـە عائیشـە، بەڵکـو شـمولی هەمـوو ئافرەتێـک دەکات، کـە لـە ڕاسـتیدا دەقەکانیـش هـەر
بـەو ئاڕاسـتەیەن.
موسـەوی دەڵێـت: « ئـەو قسـە وهەڵوێسـتانە لەسـەر [عائیشـە] و لەسـەر غەیـری
ئەویـش جێبەجـێ دەبـن، هەرچەنـدە ئەویـش هـۆکاری وتنیانـە!» ص٤٧ صـورة المـرأة
فـي التـراث الشـيعي، عـن عبـاس علـي الموسـوي، شـرح نهـج البلاغـة، ج١، ص ٤٥١
ڕاسـتیەکەی قسـەکانیش جۆرێـک لـە گشـتگیری و هەمـوواندنـی تێدایـە کـە ناکرێـت
بەرامبـەر تاقـە ژنێـک گووتـرا بێـت، هەرچەنـدە دەکرێـت کاریگـەری شـەڕی عائیشـە
لـە دژی عەلـی بەسـەر هەنـدێ لـەو بیروڕایانـەوە هەبێـت!

## ٢

## باگراوندێکی کێشەی عائیشە و عەلی

کێشـەی عائیشـە و عەلـی یـش هەرچەنـدە بابەتـی ئیمـە نییـە لێرەدا باسـی بکەیـن،
بـەڵام بەپێـی ئـەو هەواڵانـەی سـەرچاوە شـیعیەکان، و ئـەو هەواڵـە بێـت کـە لـە
سـەحیحی بوخاریـدا هاتـووە، چەنـد ڕەهەندێکـی ئـەو بابەتـە ئاشـکرا دەکات.
یەکـەم: لـەوە دەچێـت جۆرێـک لـە حەساسـیەت، و کێشـەی پەنهانـی هەبـوو بێـت
لـە نێـوان حەزرەتـی عەلـی و حەزرەتـی عائیشـە، دەنـا ئـەو هەڵوێسـتەی عەلـی هیـچ
پاسـاویکی بـۆ ناکرێـت،
دووەم: ئەگـەر ئـەو کێشـە پەنهانیـە نەبـوو بێـت، کەوابـوو ئـەو زیادەڕۆییەی کە شـیعە
و بەشـێکیش لـە سـونەش دەیکـەن دەربـارەی حیکمەتـی بـێ سـنووری حەزرەتـی
عەلـی، لـەوە ناچێـت واقیعـی بـوو بێـت، سـەرەڕای ڕێـزی بـێ پایانمـان بـۆی، بـەڵام
مـن نامـەوێ بـە شـێوازی عاتیفـی مێـژوو بخوێنمـەوە، چونکـە ئـەو هەڵوێسـتەی، هیـچ

حیکمەتێکی تێدا نییە.
سێیەم: ئەو هەواڵانە دەیسەلمێنێت، کە تێڕوانینەکانی حەزرەتی عەلی دەربارەی ئافرەت، کە لە نهج البلاغەدا هاتوون، زۆر ڕێی تێدەچێت ڕاست بن! چونکە وەک لە حەدیسەکەدا هاتووە، پاش بڵاوبوونەوەی ڕووداوی الافک، عائیشە دەگێڕێتەوە کە چۆن شەو و ڕۆژ گریاوە، لە پای ئەو بوهتانەی کە پێیان کردبو.
ئینجا پێغەمبەر بانگی حەزرەتی عەلی و ئوسامەی کوڕی زەید دەکات، کاتێ وەحی خاو بووبووەوە، بۆ ئەوەی پرس وڕایان پێبکات بۆ جیابوونەوە لە عائیشە، ئوسامە وەڵامی دایەوە بەوەی دەیزانێت لە بێ گوناهی عائیشە وپاکی ئەو، و هەروەها بەو خۆشەویستیەی پێغەمبەر هەیەتی بۆ عائیشە، گووتی: ژنی خۆتە و لە چاکە وخێری زیاتر نازانین [بڕوانە حیکمەتی ئوسامە] بەڵام عەلی کوڕی ئەبو تاڵیب گووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، خودا دەرووی لی تەنگ نەکردوویت، غەیری ئەو ژن زۆرن، ئەگەر پرسیار لە کەنیزەکەی بکەی ڕاستت پێ دەڵێت....]
[قالت: فبكيت تلك الليلة حتى أصبحت لا يرقأ لي دمع، ولا أكتحل بنوم حتى أصبحت أبكي، فدعا رسول الله – صلى الله عليه وسلم – علي بن أبي طالب وأسامة بن زيد – رضي الله عنهما – حين استلبث الوحي يستأمرهما في فراق أهله، قالت: فأما أسامة بن زيد فأشار على رسول الله – صلى الله عليه وسلم – بالذي يعلم من براءة أهله وبالذي يعلم لهم في نفسه من الود، فقال: يا رسول الله، أهلك ولا نعلم إلا خيرا. وأما علي بن أبي طالب فقال: يا رسول الله، لم يضيق الله عليک، والنساء سواها كثير، وإن تسأل الجارية تصدقك....]
ئەو وەڵامەی حەزرەتی عەلی لەوانەیە بۆ پێغەمبەریش ناخۆش بوو بێت، چونکە دەیزانی کە چۆن پێغەمبەر [د.خ] عائیشەی پەسند دەدا بەسەر هەموو ژنەکانیتری! تۆ تەسەور کە خێزانێکی نزیک لە تۆ کە هاتوو چۆت هەبیت لەگەڵیان، و باش دەیانناسیت، لە ڕووی مرۆیی و ڕەوشتیەوە. ڕۆژێک ئەو خێزانە تووشی تەنگژەیەکی خێزانی بوون، گەیشتنە سەر تەڵاق، تۆ وەک کەسێکی نزیک لەو خێزانە، هەوڵ دەدەیت نەگاتە تەڵاق، کە دەزانیت هەردوولا یەکتریان دەوێت، یان هانی تەڵاقدانی ژنەکە دەدەیت؟! دووەمیش ئەو هەڵوێستە جۆرێک لە سوک سەیرکردنی ئافرەتی تیدایە هەتا لە ئاستی عائیشەش بێت، کاتێ دەڵیت: چ زۆرە ژن زۆرە!
عائیشە ئەگەر تا دوا ڕۆژیشی ئەوەی لەبیر نەکردبێت، ناهەقی ناگیرێت وەک

ئافرەتێک، کە پێیوابوو عەلی وەک کەسێکی ماڵەوەیە، دەیزانی قسەوقسەلۆکێکی وا لە عائیشە و خێزانە بەڕێزەکەی ناوەشێتەوە، کەچی زۆر بەشێوەیەکی نامۆ هانی پێغەمبەری دا بۆ تەڵاق دانی عائیشە، بێ ئەوەی موراعاتی هەستی عائیشە و باوکی کە حەزرەتی ئەبوبەکر بوو، و هەتا هەستی پێغەمبەریش بکات، کە زۆر عائیشەی خۆش دەویست! نەدەبوایە بە قسە و واتەواتی چەند ناحەز و ساویلکەیەک بەو هەموو حیکمەتەیەوە کە باسی دەکەن، وا تێوەبگلێت! بۆیە ئەگەر ڕیوایەتەکان ڕاست بن، بە ڕیوایاتی شیعە و بوخاریشدا، دەسەلمێت کە تێڕوانینی حەزرەتی عەلی بەرامبەر ئافرەت، هیچ کاریگەریەکی ئیسلامی قووڵی بەسەردا نەبووە و گۆرانکاریەکی ئەوتۆی تێدا نەبووە لەوەی لەناو عەرەبدا باو بووە دەربارەی ئافرەت.

من ناڵێم هەموو ئەو قسانەشی کە لە خوارەوە باسیان دەکەین، هەمووی هی حەزرەتی عەلی بن، بەڵام بێگومان بەشێکی هی ئەون. بەڵکو پێموایە هەر لە بەرایی ئیسلامدا، ئەوانەی بایەخیان بە حەدیس دا و وەک مەرجەعیەتێکی هاوتای قورئان دایانمەزراند، خەڵکانێکی زۆر لە ژێر کاریگەری داب ونەریتی عەرەب و کاریگەری فەرهەنگی جیهانی باوی شارستانیەتی یونانی و هیندی و ئایینە ئاسمانیەکانی تر، کە ئەوانیش لە ژێر کاریگەری وتاری فەلسەفی یۆنانی بوون، هاتن سەدەها دەقیان دروست کرد، لە دژی ئافرەت بۆ شەرعیەتدان، بەو بیروباوەڕە باوەی کە لە جیهانی ئەو کاتە هەبوون و باو بوون لە دژی ئافرەت. ئەو حالەتە لە هەردوو لای سونی و شیعی شان بە شانی یەک بوون، ئەگەر سونە وشیعە هەتا لە تێروانینیان بۆ خوا و پێغەمبەریش چون یەک نەبن، ئەوە لە تێڕوانی نێگەتیڤیان بۆ ئافرەت یەکسانن وبە موو جیاوازیان نییە، تەنها لە چەند وردەکاری فیقهی نەبێت!

## وتەکانی عەلی لە نهج البلاغة دەربارەی ئافرەت!

لێرەدا ئەو وتانەی حەزرەتی عەلی باس دەکەین کە لە نهج البلاغة دا هاتووە دەربارەی ئافرەت:

١- لە وتارێکیدا لە سەرکۆنەکردنی شوێن کەوتوانی لەبەر بە گوێ نەکردنی دەڵێت:

( يا أشباه الرجال ولا رجال، حلوم الأطفال وعقول ربّات الحجال ) . [ئەی نیمچە پیاوانی نا پیاوان، خاوەن خەونی منداڵان و عەقڵی ئافرەتانی ناو کەژاوەکان] ص ٧٠ الشريف الرضي (الجامع)، نهج البلاغة، تعليق وفهرسة د. صبحي صالح، الطبعة الاولى بيروت ١٩٦٧. هەموو نمونەکان لە دواییدا لەو سەرچاوەیەوە وەردەگیرێت، تەنها ئاماژە بە ژمارەی لاپەرە دەکەین.

الحجال: کەژاوەیەک بوو ئافرەتان لەماڵەوە بە پەردە دەیان کرد و دەیان رازاندەوە. ربات الحجال مەبستی خاوەن کەژاوەکانە کە ئافرەتن.

وەک دەبینیت چۆن سەرکۆنەی پیاوەکانی دەکات بە سووکترین سیفات کە نیمچە پیاوانن، خاوەن خەونی منداڵان و عەقڵی ئافرەتانن! ڕاستە ئافرەت لەو ئاستە عەقڵییە دابووە لەبەر چەندین هۆکاری بابەتی ومێژوویی، بەڵام ناکرێت زاناترین پیاوی دینێک تێڕوانینێکی چاکتری لە دینەکەیەوە پێ نەبێت، وەک هەر کەسێکی ئاسایی قسەی باو دووبارەکاتەوە!

٢- لە وتارێکیدا کە لە پاش شەڕی الجمل داویەتی، ئەگەر ڕاست بێت لە دژی سەرکردایەتی لایەنی دژ بوو کە ئافرەتێک [ عائیشەی کچی ئەبوبەکر] سەرکردایەتی دەکرد، و دەڵێت :

(معاشر الناس! إنّ النساء نواقص الإيمان، ونواقص الحظوظ، ونواقص العقول، فأمّا نقصان إيمانهنّ فقعودهنّ عن الصلاة والصيام في أيام حيضهنّ، وأمّا نقصان عقولهن فشهادة امرأتين كشهادة رجل الواحد، وأمّا نقصان حظوظهنّ فمواريثهنّ على الأنصاف من مواريث الرجال، فاتقوا شرار النساء وكونوا من خيارهن على حذر، ولا تطيعوهن في المعروف حتى لا يطمعن في المنكر) .ص ١٠٥-١٠٦

[خەڵکینە، ئافرەتان باوەڕ نوقسانن و بەش نوقسان و عەقڵ نوقسانن، نەقسی باوەڕیان لەبەر ئەوەیە نوێژ ناکەن و بەڕۆژوو نابن لە ڕۆژانی حەیزدا. عەقڵ نوقسانیشیان شایەدی دوو ئافرەت بە یەک شایەدی پیاوە. نوقسان بەشیشیان

دەبینن میراتیان نیوەی میراتی پیاوانە، بۆیە خۆتان بپارێزن لە ئافرەتی خراپ و لەگەڵ باشەكانیشیان بە وریاییەوە مامەڵە بكەن، لە كاری چاكیش بە گوێیان مەكەن، تا تەماعی لە خراپە نەكەن!] لەوە دەچێت زۆر پڕ بوو بێت لەكردەوەی ئافرەتێک، كە لە توراسی عەرەبی نرخی قونكە پیازێكی نییە، چۆن لەگەڵی بچێتە ئەو جەنگە خوێناویەوە، بۆیە لە سنووری شەرع و عەقڵیش دەردەچێت كاتێ دەڵێت: " بۆیە خۆتان بپارێزن لە ئافرەتی خراپ و لەگەڵ باشەكانیشیان بە ئاگاداریەوە مامەڵە بكەن، لە كاری چاكیش بە گوێیان مەكەن، تا تەماعی لە خراپە نەكەن!"

بێگومان دەیەها ڕیوایاتی لەو جۆرە لە لای سونەش هەیە، كە تیایدا نەقس دەدەنە پاڵ ئافرەت چونكە نوێژ و ڕۆژوو ناكات لە كاتی حەیزدا، نازانن هەر قورئان و ئیسلام داوای لە ئافرەت كردوە لە كاتی حەیزدا ئەو عیبادەتانە نەكات، دەنا دەیكرد، كەوابوو بۆ دەبێتە نەقس؟! بۆ نەقسەكانیتریش هەر هەمان شت دەڵێین، كە هیچ شتی خۆكردە نین، بەڵكو خواكردەن!

٣- لە وتارێكیدا بەرەهایی تاوانباری ئافرەت دەكات كە وەک ئاژەڵ تەنها خەمێكیان لەو دنیایە هەبێت، خەمی خۆشی وجوانی ژیانە و فەسادی گێڕانە! ( ان البهائم همها بطونها، وان السباع همها العدوان على غيرها، وان النساء همهن زينة الحياة الدنيا و الفساد فيها) ص ٢١٥

[ ئاژەلان خەمیان پڕكردنی زگیانە، درندەی ئاژەلان خەمیان هەلمەتكردنە سەر ئەوانیترە، ئافرەتانیش خەمیان خۆشی وجوانی ژیانە و فەسادی گێڕانە تیایدا!] ئەوە وتاری هەموو شارستانی ولایەن و دینێكە كە هەڵوێستی نێگەتیڤیان لە ئافرەت وەرگرتووە لە گریكەكانەوە بگرە تا هیندۆسەكان و بوداییەكان و مەسیحی و جولەكەكانیش، بەداخەوە ئیسلامیشی هاتە سەر!

# ٣

٤- لە وتاریکیدا کە ڕاشکاوانە ئاماژە بە حەزرەتی عائیشە دەکات و دەڵێت: (واما فلانه فادرکها رأی النساء وضغن غلا فی صدرها کمرجل القین، ولودعیت لتنال من غیری ما أتت الیّ لم تفعل، و لها بعد حرمتها الاولی والحساب علی الله تعالی.) ص ٢١٨

[فولانە ئافرەت، ڕای ئافرەتانی کەوتە سەر و قینێکیش لە دڵیدا نێڵەی دەدا وەک کورەی ئاسنگەر، ئەگەر بانگ کرابا بۆ زیان گەیاندن بە کەسێکی تر، ئەوەی نەدەکرد، ڕیزی بەرایشی هێشتا هەر هەیە و حیسابیشی لەسەر خوایە.]

مەبەستی لە فولانە عائیشەیە وەک ابن ابی الحدید معتزلی لە شەرحی نهج البلاغة دا دەڵێن « و فلانه کنایه عن ام المؤمنین عائشه ابوها ابوبکر. شرح نهج البلاغه ٩/١٩٠

لەو دەقەش سەرکۆنەی عائیشە دەکات، بەوەی بێ عەقڵی ژنان، یان کەم عەقڵی ونوقسانی لە خەیاڵیداوە! دەکرێت هەڵوێستی عائیشە لە عەلی، لەبەر خودی عەلی و کۆنە قینی بێت لیی، کاتێ هەرزانی کرد لای پێغەمبەر [د.خ] وگووتی: تەلاقی بدە! بەلام باوەڕ ناکەم هەڵوێستی حەزرەتی عەلی لە ئافرەت، لەبەر عائیشە بوو بێت، بەڵکو لە بنچینەدا حەزرەتی عەلی وەک هەر تاکێکی تری نێرینەی ئەو کۆمەڵگا عەرەبیە، لە ژێر کاریگەری داب ونەرێت و بیروبۆچوونی باو بووە دەربارەی ئافرەت، تورەیەکەشی لەبەر ئەوە بووە، کە هیچ پیاوێک لەو کۆمەڵگایە چاوەڕوانی ژنێکی جەنگاوەری وەک عائیشەی نەکردوە، نەریتی باوی نێرسالارانە بسکێنیت، بەتایبەتی کە پەروەردەی مالی پێغەمبەرایەتیش بێت!

٥- لە راسپاردەیەکی بۆ سوپاکەی بەر لەشەڕی صفین دەڵێت: (ولا تهیجوا النساء بأذی، وان شتمن اعراضکم، وسببن امراءکم، فانهن ضعیفات القوی والانفس و العقول..) ص ٣٧٣

لەو دەقەشدا گوایە جوامێریەک نیشان دەدات، کە نابێت ئەزیەتی ژن بدرێت، بەلام نەک لەبەر ئەوەی مرۆڤگەلێکی ناسکن و دەبێت ڕیزیان لێ بگیرێت، بەڵکو لەبەر کەم عەقڵیان! دەڵێت: [ئافرەتان ئازار مەدەن، هەتا جوێنیان بە عەرزیشتان دا، و جوێنیان بە سەرکردەکانیشتان گووت، چونکە زەعیفەن لە ڕووی هێز و دەروون

و عەقڵدا!!]

خۆی ئـەوە فەزیڵەتـە لـە هـەر کۆمەڵگایـەک کـە بـە نەرمـی هەڵسـوکەوت بکەیـت لەگەڵ ئافرەت، هەتا ئەگەر ئەوانیش هەڵچوون بە ڕووتدا، بـەڵام نـەک لەبەرئـەوەی ناقیسـی هێـز وعەقڵ ودەروونـن، بەڵکو دەتوانیت بڵێیت هەسـت ناسـکترن.

یان لەبەر پایەی دایکایەتی و ئافرەت بوون، ڕێزێکی تایبەتیان هەبێت لە کۆمەڵ! وەک دەبینیـن حەزرەتـی عەلـی هیـچ جیاوازیەکـی نەبـوە، لـە هەڵوێسـتی لـە ئافـرەت لەگـەڵ هـەر تاکێکـی کۆمەڵـگای عەرەبـی ئـەو کاتـە، بەوپـەڕی لاوازی و عەقـڵ نوقسـانیەوە دەیڕوانیـە ئافـرەت.

٦- لـە دەقیکیتـردا کـە ئەویـش لـە پـاش شـەڕی صفیـن وتـراوە، و تورەییەکـی زۆری پێـوە دیـارە، دەڵێـت: (و إیّـاك و مشـاورة النّسـاء فـإنّ رأیهـنّ إلـی أفـن و عزمهـنّ إلـی وهـن . و اکفف علیهنّ من أبصارهنّ بحجابك إیّاهنّ فإنّ شدّة الحجاب أبقی علیهنّ، و لیس خروجهنّ بأشدّ من إدخالك من لا یوثق بـه علیهنّ، و إن اسـتطعت أن لا یعرفـن غیرك فافعل . و لا تملّك المرأة من أمرها ما جاوز نفسها فإنّ المرأة ریحانـة و لیسـت بقهرمانـة، و لا تعد بکرامتها نفسها، و لا تطمعها في أن تشفع بغیرها . و إیّاك و التّغایر فـي غیـر موضـع غیـرة، فـإنّ ذلـك یدعـو الصّحیحـة إلـی السّـقم و البریئـة إلـی الرّیـب . و .... ) ص ٤٠٥

[ ئـاگادار بـە نەکـەی پرسـوڕا بـە ئافرەتـان بکەیـت، چونکـە ڕایـان نوقسـانە،و عەزیمەتیـان لاوازە، مەهێڵـە بەرچـاوان کـەون، بیانشـارنەوە بـە حیجـاب کردنیـان، چونکە چەند حیجابی توونـد بێت، باشـترە بۆ مانەوەیان! دەرچوونیشـیان لـە ماڵەوە خراپتـر نییـە، لـە هێنانـە ماڵـەوەی کەسـێکی وا کـە ناتوانیـت متمانـە بـە ئافرەتەکـەت بکەیـت لەگەڵیـدا! ئەگـەر توانێـت نەهێڵـی کـەس بناسـن باشـترە، ئافـرەت لـە خـۆی زیاتـر کاروبـاری کەسـیتری بەدەسـت نییـە، چونکـە ژن ڕێحانـە نـەک سـەردار و کاری خەڵکیتـر هەڵسـوڕێنێت. لـە کەرامـەت و ڕێـزی خـۆی زیاتـر تێنەپەڕێـت، فێـری ئـەوەی مەکـە کەسـانێک بکاتـە تکاکاری خـۆی، ئاگاداربـە غیـرەش نەکـەی لـە کاتـی ناپێویسـتدا، چونکە ئەو جۆرە غیرەتکردنـە کەسـی سـاغ بـەرەو خراپـی دەبات، وبێ تـاوان دەکاتـە گومانلێکـراو.....]

دەقەکـە خـۆی دەدوێـت و دەیەوێـت بـە توندتریـن شـێوە مامەڵـەی ئافـرەت بکرێـت، حیجابێکـی تونـدی بەسـەر سـەپێنرێت، هـەردەم ژێردەسـت بێـت، نـەک خـاوەن هیـچ شـتێکی تـر.

لە بەشی حیکمەتەکانی ئیمامی عەلی  لە نهج البلاغة دا هاتوە:
دەڵیت: المرأة عقرب حلوة اللسبة. [ئافرەت دوپشکێکە پێوەدانی شیرینە] وەک دیارە ئافرەت بە دوپشکێکی ترسناک دەشوبهێنێت، کە تەنانەت پێوەدانیشی بۆ خەڵک وا تەسویر کراوە کە شیرینە. نازانم حەزرەتی عەلی کە هێندە زانا بووە بە قورئان، چۆن گوێی لەو ئایەتە نەبووە کە دەڵێت [والمؤمنون و المؤمنات بعضهم اولیاء بعض] یان [هن لباس لکم وانتم لباس لهن] سەرەرای فەرموودەی زۆر پۆزەتیڤی پێغەمبەر [د.خ] دەربارەی ئافرەت.
لەوەدەچێت حەزرەتی عەلی قاموسێکی پێچەوانەی بۆ سیفەتەکانی ئافرەت وپیاو هەبێت، لای ئەو هەر سیفەتێکی سروشتی پۆزەتیڤ یان نێگەتیڤ بێت، بۆ ئافرەت خراپە، وبۆ پیاو زۆر باشە! بۆ نمونە هەر لەو بەشە دەربارەی غیرەی ژنان وپیاوان دەڵێت: (غیرة المرأة کفر و غیرة الرجل ایمان)  وەک دەبینیت هەتا یەکێ لە سەرەکیترین تایبەتمەندی ئافرەتان کە غیرە کردنە، و زانراوە کە ئافرەت زیاتریش لە پیاو غیرە دەکات، حەزرەتی عەلی ئەو غیرەکردنە بە کوفر دەزانێت بۆ ئافرەت، کەچی هەمان ئەو غیرەیە، کە جاروبار دەبێتە غیرەیەکی نەخۆشانە لای پیاو، ئافرەتی پێوە ئەشکەنجەی دەروونی و جەستەیی دەدات، بە ئیمانی دەزانێت بۆ پیاو! هەر لەو سیفەتەش پێی وانیە، بەڵکو لە حیکمەتێکیتردا دەلیت: « خیار خصال النساء شرار خصال الرجال، الزهو والجبن والبخل ،فاذا کانت المراة مزهوة لم تمکن من نفسها واذا کانت بخیلة حفظت مالها ومال بعلها واذا کانت جبانة فرقت من کل شيء یعرض لها ”. ٥٠٩-٥١٠
[باشترین سیفاتی ئافرەتان، خراپترین سیفاتی پیاوانە، لوتبەرزی وبەخۆنازین، و ترسنۆکی و ڕەزیلی، ئەگەر ئافرەت لووتبەرز وبەخۆناز بوو خۆی ناداتە دەست، ئەگەر ڕەزیل بوو پارەوپولی خۆیی و مێردی دەپارێزێت، ئەگەریش ترسنۆک بوو لە هەموو شتێک دەترسێت کە تووشی دێت] بۆ دەبێت ئەو ڕەزیلی و ترسنۆکیە ئەوپەڕی عەیبوعار بێت بۆ پیاو کەچی چاکترین سیفاتی ئافرەت بێت؟!
سەیر لەوەدایە وتەیەکی زۆر ناودار هەیە لەسەر ئافرەت، من تا ساتی ئەو نووسینەش نەمزانیبوو کە وتەیەکی حەزرەتی عەلی یە بەپێی نهج البلاغة، کە دەلیت (المرأة شر کلها و شر ما فیها انە لابد منها.)
[ئافرەت هەمووی شەڕ و خراپەیە، خراپترین خراپیەکانی کە چارەمان نییە بێ ئەوان، یان خراپەیەکی پێویستە!] ئەو وتەیە سێبەرەکانی لەناو فەرهەنگی یۆنانی

و بودایی و جولەكایەتی و مەسیحیەتیش دەدۆزیتەوە، هەتا بۆتە پەندیش لە زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی: Women are necessary evils
ئەو نمونانەی هێنامان هەمووی لە نهج البلاغة دا هاتووە، بیروڕای نێگەتیڤیتریشی هەن لە سەرچاوەكانیتری شیعە

ڕایەكانی عەلی لە دەرەوەی نهج البلاغة
« كل امرئ تدبره امرأة فهو ملعون» [هەر كەسێك ئافرەت بەڕێوەی ببات مەلعونە!]
" عقول النساء في جمالهن " [عەقڵی ئافرەتان لە جوانیاندایە] و " النساء بذر الشر "[ئافرەتان تۆ وبنچینەی خراپەكارین]
« ان في خلافهن بركة" [لە پێچەوانەكردنیان بەرەكەت هەیە]
الصدوق، من لا يحضره الفقيه، ج٣، ص٤٦٨.
ئەوە كۆی ڕاكانی حەزرەتی عەلی یە دەربارەی ئافرەت كە وەك دەبینین زۆر نێگەتیڤن و وەك عەقاد لە عبقرية علي دا دەڵێت:
«بە گشتی، دەكرێت بوترێت كە بیروڕاكانی ئیمام [عەلی] دەربارەی ئافرەت بریتیە لە پوختەی هەموو حیكمەتە كۆن و دێرینەكان لە بارەی ئافرەت گووتراوە. ئافرەت خراپە و شەڕێكی ناچارین بە كۆی بیروڕای بەراییەكان، چ حەكیمەكانی هیند بێت، یان یۆنان یان ئەو حەكیمانەی تەماشای ئافرەتیان دەكرد، بە چاوی دین لە بەنی ئیسرائیل یان باوكانی كەنیسەی مەسیحی و ئیمامەكانی ئیسلام.!»
ص ٢١٠ عبقرية علي
ببینە عەقاد چەند بلیمەتانە عەلی و [أئمة الاسلام] یش دەخاتە بەر كۆی بیروڕای دێرینەكان، لە حەكیمەكانی هیند و یۆنان و هەموو حەكیمە ئایینیەكانی بەنی ئیسرائیل و باوكانی كەنیسەی مەسیحی كە لە ڕوانگەی دینەوە ئافرەتیان وەك شەڕێكی [لا بد منه] پێویست دەبینی.

سەرچاوەكان

١- نهج البلاغة، تعليق وفهرسة د. صبحي صالح، الطبعة الاولى بيروت ١٩٦٧
٢- صورة المرأة في التراث الشيعي، تفكيك لاليات العقل النصي، محمد الخباز. دار الانتشار العربي، الطبعة الاولى ٢٠٠٩.
٣- عبقرية علي، عباس محمود العقاد، دار الكتاب العربي- بيروت

# کیسەکەی ئەبو هوڕەیرە یان کارخانەی حەدیس!

ئەبو هوڕەیرە ئەو سەحابەیەیە، کە لە چاو سەحابەی ناوداری وەک ئەبوبەکر وعەلی وعومەر و عوسمان و بیلال و عەممار، ماوەیەکی زۆر کەم لەگەڵ پیغەمبەر ژیاوە، تەنها ساڵێک و نیو، بەڵام ناوی زیاتر دێت! هەر هێندەش نا، لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی زۆرترین حەدیسە، سەحابە گەورەکان کە لە یەکەم ڕۆژەوە لەگەڵ پێغەمبەر بوون، بە هەموویان بە قەد ئەو حەدیسیان نەگێڕاوەتەوە!

ئەبو هورەیرە لەپاش شەڕی خەیبەر موسڵمان بوو،ە ولە یەمەنەوە بەرەو مەدینە هاتووە. یانی نە موهاجیر بوو، ونە ئەنسارِ بوو، و نە خاوەنی مێژوویەکی وا بوو لەناو ئیسلامدا. هەتا ناوی باوکی نازانرێت و مشتومڕیکی زۆری لەسەرە!

ئەبو هوڕەیرە خاوەنی ٤٤٦ حەدیسە، لە تێکڕای چوار هەزار حەدیسی بوخاری، وبەهەموو خەلیفەکانی ڕاشدینەوە ٢٥٪ ئەو ژمارەی ئەویان ڕیوایەت نەکردوە! هەتا حەزرەتی عەلی کە باوکی قسە و حیکمەتی سەحابەکان بوو، تەنها ١٥ حەدیسی لێ گێڕدراوەتەوە لە بوخاری ومسلم!

خەڵکێکی زۆر دەربارەی کەسایەتی نامۆی ئەبو هورەیرەیە، بابەتی زۆریان نوسیوە، بە باش وخراپ. کەسانێک ئاماژە بە ژیانی کولەمەرگی و سەعلوکی دەکەن، کە چۆن کەسێکی برسی و بێ دەرەتان بووە. زۆرجار بە ئەنقەست ملی یەکێکی دەگرت، وپرسیاری درێژی لێدەکرد، تا لەگەڵی بچێتەوە سەر خوانی نان خواردن، هەتا زۆرکەس ئاگادار ببووەوە لەو سیفەتەی ئەبو هورەیرە!

لە حەدیسێکی بوخاری دەگێڕێتەوە کە لەبرساندا لاکەی لێوە دەهات، و بەردی لە زگی خۆی دەبەست! ڕۆژێک لەسەر ڕێگای گەڕانەوەی خەڵک وەستام، و ئەبوبەکرم دیت و پرسیاری ئایەتێکم لێ کرد، تەنها بۆ ئەوەی زگم تێر بکات، بەڵام داوەتی نەکردم، ئینجا عومەر هات هەمان شت داوەتی نەکردم، ئینجا ئەبو قاسم محەمەد [د.خ] تێپەڕی، بزەیەکی کرد و زانی چیم لەدڵدایە و ڕوخساری خوێندمەوە،.....“

( .. آلله الذي لا إله إلا هو، إن كنت لأعتمد بكبدي على الأرض من الجوع، وإن كنت لأشد الحجر على بطني من الجوع، ولقد قعدت يوما على طريقهم الذي يخرجون منه، فمر أبو بكر فسألته عن آية من كتاب الله ما سألته إلا ليشبعني فمر ولم يفعل، ثم مر بي عمر فسألته عن آية من كتاب الله ما سألته إلا ليشبعني فمر ولم يفعل،

ثم مر بي أبو القاسم ـ صلى الله عليه وسلم ـ فتبسم حين رآني وعرف ما في نفسي وما في وجهي، ثم قال : يا أبا هِر ! قلت: لبيك يا رسول الله، قال: الحق بنا ... ( البخاري ).

دەڵێن ئەبو هورەیرە چاکترین بازرگانی کە کردبێتی، دروستکردنی حەدیس بووە! کەسانێکیش تا سەر ئێسقان بەرگری لێدەکەن لە سەلەفیەکان وئەهلی قال وقیلەی حەدیس، بە هەموو ڕیوایاتی خراپ و چاک و پڕ خورافاتەوە.

لە کۆنەوە لەسەر کەسایەتی ئەو پیاوە لە نێوان ڕەخنەگر وستایشکەری، جیاوازیەکی زۆر هەبووە، شیعەکان و ئەهلی مەدرەسە عەقڵیەکان، زۆر سەرکۆنەی دەکەن لەسەر زۆر وبۆری ڕیوایەتەکانی، کە زۆریان لە ئەجوائێکی ئوستوری وئەفسانە ئامێزدا باسکراوە! هەتا ئێستا لە ناو ئەهلی سونەش، جگە لە سەلەفیەکان قسەی زۆری لەسەر دەکرێت، خەڵکی موسڵمان ئاگداربوونەتەوە لە شوێنەواری تێکدەرانەی هەندێ لە ڕیوایەتەکانی ئەبو هورەیرە.

سەیر لەوەدایە ئەبو هورەیرە لەلایەن خودی ژنانی پێغەمبەر و ئەسحابەکانەوە تاوانبار دەکرا بە درۆکردن، عومەر چەندین جار بە دار لێی داوە، و تۆمەتباری کردوە بە درۆکردن و هەڕەشەی لێکردوە دەم نەکاتەوە! خەلیفە عومەر زۆرجار پێیدەگووت: یان واز لە حەدیس دەهێنیت یانیش دەتنێرمەوە خاکی دوس، کە شوێنەزای ئەبو هورەیرە بوو! لە پاش عومەر فورسەتی لێهێنا، و دەستیکردەوە بە بەیت وبالۆرەی قال و حدثنا هەتا دەیگووت: من حەدیسگەلێکی واتان بۆ دەگێڕمەوە لە سەردەمی عومەر باسم کردبا سەری دەشکاندم!

"عن إسماعيل بن عبيد الله عن السائب بن يزيد سمع عمر يقول لأبي هريرة لتتركن الحديث عن رسول الله صلى الله عليه وسلم أو لألحقنك بأرض دوس، وعن يحيى بن أيوب عن ابن عجلان أن أبا هريرة كان يقول إني لأحدث أحاديث لو تكلمت بها في زمن عمر لشج رأسي ."

دایکی موسڵمانان عائیشە، زۆر لێی بێزار بوو سەیری پی دەهات ودەیگووت: ئەو حەدیسانە چیە کە لە تۆوە گوێمان لێدەبێتەوە بە دەمی پیغەمبەر دەیکەیت، هەر ئەوەت نەبیستوە ئەوەی ئێمە بیستومانە، و ئەوەشت نەدیتوە کە ئێمە دیومانە؟! یانی تاوانباری دەکرد بە هەڵبەستنی درۆ ودەلەسە!

"ما هذه الأحاديث التي تبلغنا أنک تحدث بها عن النبي (ص) ؟ هل سمعت إلا ما سمعنا ورأيت إلا ما رأينا ؟"

# عوزرەکانی ئەبو هورەیرە

سـەیر لەوەدایـە کـە بـە ئەبـو هورەیرەیـان دەگـووت، ئـەو هەمـوو حەدیسـە چیـە دەیگێڕێتـەوە، بـە درۆزنیـان لـە قەڵەم دەدا، هەردەم حوجەتی خۆی هەبوو ودەیگووت: دەڵێـن ئەبـو هورەیـرە حەدیسـی زۆر دەگێڕێتـەوە، خـودا کۆمـان دەکاتـەوە! دەڵێـن بـۆ موهاجیـر وئەنسـارەکان بەقـەد ئـەو حەدیـس ناگێڕنـەوە!؟ برایانـی موهاجیـرم خەریکی بـازاڕ بـوون و برایانـی ئەنسـارم خەریکی کارەکانیـان بـوون لـە ئـەرزە و مولکەکانیـان! مـن هەژارێـک بـووم، یـاوەری پیغەمبـەرم دەکرد بـە نـان وسـک، لـەوێ بـووم کـە ئەوانـی لـێ نەبـوو، لەبیـرم بـوو کاتـێ ئـەوان لەبیریـان دەچـۆوە!

"يقولـون ان أبـا هريـرة يكثـر الحديث! واللـه الموعد! ويقولـون مـا للمهاجرين والأنصار لا يحدثـون مثـل احاديثـه؟ وان اخوتـى مـن المهاجريـن كان يشـغلهم الصفـق فـى الأسـواق وان اخوتـى من الأنصـار كان يشـغلهم عمـل أموالهـم! وكنـت امـرءاً مسـكيناً الـزم رسـول اللـه علـى مـلء بطنـى فأحضـر حيـن يغيبـون! وأعـى حيـن ينسـون!!"

بەڵکـو هەتـا وەڵامـی نزیکتریـن و خۆشەویسـترین ژنـی پێغەمبـەری دەدایـەوە، کـە ئـەو لەویش باشـتر ئـاگای لـە پیغەمبـەر بـووە! لـە مسـتدرکی حاکـم دەگیرێتـەوە کـە عائیشـە بانگـی کـرد و گووتـی: ئـەو حەدیسـانە چیـە کـە لـە تـۆوە گوێمـان لێدەبێتـەوە، بـە دەمـی پیغەمبـەر دەیکەیـت، هـەر ئـەوەت نەبیسـتوە ئـەوەی ئێمـە بیسـتومانە و ئەوەشـت نەدیتـوە کـە ئێمـە دیومانـە؟! گووتـی: دایکـە تـۆ لـە پیغەمبـەر بـێ ئـاگا و خەریـک دەبوویـت لەبـەر ئاوێنـە و کلـدان و خۆڕازاندنـەوە بـۆ پیغەمبـەر [د.خ] مـن هیـچ خەریکـی نەدەکـردم لـەو!

" عـن عائشـة أنهـا دعـت أبـا هريـرة فقالـت لـه : يـا أبـا هريـرة مـا هـذه الأحاديث التي تبلغنـا أنـک تحـدث بهـا عـن النبي صلـى اللـه عليـه و سـلم هـل سمعت إلا مـا سـمعنا و هـل رأيـت إلا مـا رأينـا ؟ قـال : يـا أمـاه إنـه كان يشـغلک عـن رسـول اللـه صلـى اللـه عليـه و سـلم المـرآة و المكحلـة و التصنـع لرسـول اللـه صلـى اللـه عليـه وسـلم و إنـي و اللـه مـا كان يشـغلني عنـه شـيء !!!"

# کیسەکەی ئەبو هوڕەیرە یان کارخانەی حەدیس!
# ٢

سەیر لەوەدایە هەر قورئان ڕەدی ئەبو هورەیرە دەداتەوە کە وەسفی ئەسحابەکان دەکات بە: [ رجالٌ لا تلهیهم تجارة ولا بیع عن ذکر الله .. ] پیاوانێک بازرگانی و کڕین وفرۆشتن بێ ئاگایان ناکات لە زیکری خوا! ئینجا نیوەی زیاتری ئەسحابەکان هەر بێ ئیش بوون، ئەوەشی ئیشی هەبوو پارت تایم بوو، دەبێت کاری چی هەبوبیت لەو شارە وشکە؟! سەرەڕای ئەهلی الصفة کە هەژار و بێ دەرەتان بوون لە مزگەوت دەژیان! بۆ کەس بە قەد ئەبو هورەیرە حەدیسی نەبیست؟! ئینجا مەسەلە زۆری حەدیسیش نییە بەس، بەڵکو جۆریتی، بۆی هەیە یەک حەدیس سەرلەبەر ژیانی ئومەتێک بگۆڕێت! بۆ نمونە حەدیسێکی سیما یەهودی وەک کە دەڵت: ئەگەر دایکە حەوا نەبا، هیچ ژنێک خیانەتی نەدەکرد! عن أبي هريرة رضي الله عنه، عن النبي صلى الله عليه وسلم قال : لولا حواء لم تخن أنثى زوجها) !!! کە لە بوخاری ومسلم دا هاتووە! باشە خۆ بەو قسەیە بێت دەبوایە پیاوەکانمان زۆر شەریف و پاک بان، مادام ئادەم خیانەتی نەکردوە! کەچی وانییە پیاو زیاتر لە ژن خیانەت دەکەن! ئەوە کێشەکە نییە، کێشە لێرەدا چەمکی سەقەتی ئەو حەدیسەیە، لای دەقپەرستانی حەدیس چۆن دەتوانن پاش ئەو حەدیسە بە ڕێزەوە و بە متمانەوە بڕوانن بۆ ئافرەت؟!

یان ئەو حەدیسەی کە دەڵێت: ئافرەت و گوێدرێژ و سەگ نوێژ دەبڕن!
حديث أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : ( يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْمَرْأَةُ وَالْحِمَارُ وَالْكَلْبُ ...) رواه مسلم

دەیان عوزر دەهێننەوە بۆ ئەو حەدیسە کە مەبەست سوکایەتی نییە بە ئافرەت، بەڵام حەزرەتی عائیشە باش تێی گەیشتبوو، ئافرەتێکی زمانزانی زانا بوو، بە ئەدەبیاتی عەرەب وگووتی: خراپ ئێمەتان بە سەگ و گوێدرێژ چواندوە! بئس ما شبهتمونا بالحمير والكلاب
( رواه البخاري)
یان حەدیسێکیتری وەک: ئەو ئومەتە نەجاتی نابێت ژنێک کاروباریان بەڕێوە

ببات! لا يفلح قوم ولوا امرهم امرآة! ئەوە ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی نەکردوە، بەڵام بۆ نمونە هێناومە، ئەو حەدیسە بە موتابەعەی من گەورەترین بەربەست بووە لەبەردەم گەشەسەندنی پایەی ئافرەت لە ئیسلامدا، هەر ئافرەت دەستی بۆ کارێک بردوە، یەکسەر ئەو حەدیسەیان بە نێوچەوانی داداوە!

ئەگەر زۆر لەگەل پێغەمبەر بوون حەدیسی زۆری لی بکەوێتەوە، کوا حەدیسەکانی حەزرەتی عەلی، کە پیغەمبەر وەک کوڕی خۆی بە خێوی دەکرد؟!

کوا حەدیسەکانی سەلمان فارسی ،کە لەوانەیە سەدان شەو دوو بە دوو لەگەڵ پێغەمبەر کۆبوبێتەوە وەک عائیشە دەڵێت: سەلمان مەجلیسێکی تایبەتی هەبوو لەگەڵ پیغەمبەر لە شەودا دوو بە دوو، هێندەی نەمابوو پیغەمبەرمان لێ زەوت بکات! "وقالت عائشة ـ كما فی ترجمته من الاستیعاب ایضا ـ كان لسلمان مجلس من رسول الله ینفرد به فی اللیل حتی كاد یغلبنا علی رسول الله صلی الله علیه واله وسلم"

کوا ژمارەی حەدیسەکانی ئەو مەجلیسانەی پێغەمبەر و سەلمان، چی گوتراوە لەو دانیشتنە بەردەوامانە؟! کە بێگومان هەر قسەی تێداکراوە، ئەو هەموو گرنگییەی سەلمان چی بوە بۆ پێغەمبەر شەوانە تایبەت لەگەڵی دانیشێت؟!

## کیسەکەی ئەبو هوڕەیرە
## ٣

لەوەش خراپتر کیسەکەی یان جۆڕکەکەی یان جۆرابەکەی ئەبو هورەیرە بوو! ئەوە هۆکارێکی ترە بۆ ئەوەی گومان بخرێتە هەموو قال و قیلەکانی. زۆرجار کە قسەیەکی دەگێڕایەوە لە پیغەمبەر سوێندیان دەدا: توخوا وات گوێ لێبوە لە پێغەمبەر؟! دەیگووت نا نەخێر ئەوەم لە کیس و جورابی خۆم یان لە گیرفانی ئەبو هورەیرە دەرهێنا، هەرچەندە قسەکەی بە دەمی پیغەمبەر دەست پێدەکردو دەیگووت: قال رسول الله!

ئەوە هەندێک لەو حەدیسانەیە، وەک دەبینن لە بوخاریشدا هاتوە، حەدیسەکان شرۆڤە ناکەین تەنها ببینن چۆن لە چەندین بۆنەدا کە لێی دەپرسن ئەو حەدیسە لە پێغەمبەرەوەیە، دەڵێت نەخێر لە کیسەی ئەبو هورەیرەوەیە!:

روى البخاري في صحيحه قال حدثنا عمر بن حفص: ... حدثني أبو هريرة رضي الله عنه قال : قال النبي صلى الله عليه وسلم: أفضل الصدقة ما ترک غنى، واليد العليا خير من اليد السفلى، وابدأ بمن تعول, تقول المرأة: إما أن تطعمني، وإما أن تطلقني، ويقول العبد: أطعمني واستعملني، ويقول الابن: أطعمني، إلى من تدعني, فقالوا : يا أبا هريرة، سمعت هذا من رسول الله صلى الله عليه وسلم ؟ قال: لا هذا من كيس أبي هريرة.

لە مسند أحمدەوە هاتووە، عن أبي هريرة قال: قال رسول الله صلى الله عليه وسلم: إن أفضل الصدقة ما ترک غني .تقول امرأتک : اطعمني و إلا طلقني، ويقول خادمک : اطعمني و إلا فبعني، و يقول ولدک: إلى من تكلني ؟ قالوا : يا أبا هريرة هذا شيء قاله رسول الله صلى الله عليه وسلم أم هذا من كيسک ؟ قال : بل هذا من كيسي

بڕوانە لێرە کە قسەیەک بە دەمی پیغەمبەر دەگێڕێتەوە، دیارە گومانیان زۆر هەبووە لەسەرو و مەشهور بووە بە هەڵبەستن بە دەوی پیغەمبەر، بۆیە لێی دەپرسن: ئەی ئەبو هورەیرە ئەوە قسەی پێغەمبەرە یان لە کیسەی خۆت هێناوتە؟! " قالوا : يا أبا هريرة هذا شيء قاله رسول الله صلى الله عليه وسلم أم هذا من كيسک ؟"

هەر لە مسند أحمدەوە... عن المغيرة ... سمع أبا هريرة قال ثم نهى رسول الله صلى الله عليه وسلم عن كسب الحجام وكسب البغي وثمن الكلب قال وعسب الفحل قال وقال أبو هريرة هذه من كيسي .

لە سنن النسائي هاتووە: عن أبي هريرة قال : قال رسول الله صلى الله عليه و سلم : خير الصدقة ...و يقول العبد : أنفق علي، واستعملني قيل : يا أبا هريرة، هذا عن النبي صلى الله عليه و سلم ؟ قال : لا هذا من كيسي

لە التمهيد لابن عبد البر هاتووە: ... عن عطاء ابن ميناء عن أبي هريرة أنه قال كنت حدثتكم من أصبح جنبا فقد أفطر فإنما ذلک من كيس أبي هريرة فمن أصبح جنبا فلا يفطر...

لە سنن أبي داود هاتووە [ جزء ١ - ٥٢٥ ] لە هەمان ڕێگای الاعمش کە هەمان ڕێگای بوخاری یە، لەگەڵ قووتکردنی [کیسەی ئەبو هورەیرە]! شامییەکان وادیارە ئەو پارچەیان شاردۆتەوە بۆ ئەوەی ناو وشۆرەتی ئەبو هورەیرە بپارێزن، لەو دان پێداهێنانە! لە کاتێکدا بوخاری وئەحمەد باسی دەکەن!

# شاهێدە مردووەکانی ئەبو هوڕەیڕە!

مـن لـەو بڕوایـەدام حەدیسەکانیتریشـی ئەگـەر پرسـیاریان بـە جیـدی لێکردبـا دەیگـووت لـە کیسـی ئەبـو هورەیـرە وەیـە!
لـە سـەحیحی مسـلم داهاتـوە کـە شـتێکی بـە دەمـی پێغەمبـەر گێڕاتـەوە، دوایـی کـە دەچنـە لای ژنانـی پێغەمبـەر بـە پێچەوانـەی ئـەو دەڵێـن، پیغەمبـەر بـی نوێژیـس دەبـوو بەیانیـش هـەر بـە ڕۆژوو دەبـوو، نکولـی لێـدەکات ودەڵێـت مـن لـە فەزڵـی کوڕی عەباسم بیستووە نـەک پێغەمبـەر! : روی مسـلم فـي صحيحـه قـال :... سـمعت أبـا هريـرة رضـي اللـه عنـه يقـول فـي قصصـه ثـم مـن أدركـه الفجـر جنبـا فـلا يصـم فذكـرت ذلـک لعبـد الرحمـن بـن الحـارث لأبيـه فأنكـر ذلـک فانطلـق عبـد الرحمـن وانطلقـت معـه حتـى دخلنـا علـى عائشـة وأم سـلمة رضـي اللـه عنهمـا فسـألهما عبـد الرحمـن عـن ذلـک قـال فكلتاهمـا قالـت كان النبـي صلـى اللـه عليـه وسـلم يصبـح جنبـا حلـم ثـم يصـوم ...قـال فجئنـا أبـا هريـرة وأبـو بكـر حاضـر ذلـک كلـه قـال فذكـر لـه عبـد الرحمـن فقـال أبـو هريـرة أهمـا قالتـاه لـک قـال نعـم قـال همـا أعلـم ثـم رد أبـو هريـرة مـا كان يقـول فـي ذلـک إلـى الفضـل بـن العبـاس فقـال أبـو هريـرة سـمعت ذلـک مـن الفضـل ولـم أسـمعه مـن النبـي صلـى اللـه عليـه وسـلم .
لـە ڕووی ئەمانەتـەوە چەندیـن ڕیوایـەت هەیـە کـە دەیسـەلمێنن ئەمیـن وسەرڕاسـت نەبـووە لـە گوێزانـەوەی حەدیـس، وحەدیـس گێڕانـەوەی بـۆ ئامانجـی سیاسـی گێراوەتـەوە: کـە ئەبـو هورەیـرە ئەگـەر معاویـە پـارەی دابایـێ بـێ دەنـگ دەبـوو، ئەگەریـش نەیدابـا ومووچـە بڕابـا، قسـەی دەکـرد!
لـە موسـنەدی الإمـام أحمـد بسـنده الصحيـح إلـى سـعيد بـن المسـيب قولـه (كان أبـو هريـرة إذا أعطـاه معاويـة، سـكت، فـإذا أمسـک عنـه، تكلـم)، مەعلومیشـە کـە سـعيد بـن المسـيب پیاوەکـی سـیقەیە و زاوای ئەبـو هورەیرەشـە! سـەرجاوە: سـير أعـلام النبـلاء والبدايـة والنهايـة لابـن كثيـر. لـە سـير أعـلام النبـلاء [ج ٢ / ٦١٥] هەمـان هـەواڵ هاتـووە!
باشـە چـی دەمینێتـەوە لـە عەدالـەت و ئەمانـەت کـە تـۆ پارەت بدەنـی بـێ دەنـگ بیـت، ونەتدەنـێ قسـە بکەیـت؟! ئـەوە چـۆن لـە میزانەکـەی جـەرح وتەعدیـل ڕزگاری بـووە، ئەگـەر قاعیدەیەکـی سـەقەتی وەک عەدالەتـی ڕەهـای سـەحابە نەبـا؟!

جاوەرە سەحابەیەکی وا قسە لە گیرفانی و کیسەی خۆی دەربهێنێت بیکاتە ناوی پیغەمبەرەوە، دەبێت ئەوانی دوای ئەو چیان کردبێت؟!
من لەو وتارەدا هیچ مەبەستم تانەدان نییە لە ئەبو هورەیرە، جونکە ئەو مرۆڤ بوو، بەڵکو دەمەوێت بیسەلمێنم کە ئەو تەقدیسەی سەلەفیەت دەیکات بۆ سەحابە ڕاست نییە، ئەوانیش وەکو ئێمەمانان بوون، باش وخراپ و ئازا و ترسنۆک و ڕاستگۆ و درۆزن و خۆنەفرۆش و فرۆشیاریان تێدا بووە! هەست دەکەم زۆر لە ڕوخساری کەسایەتی ئەبو هورەیرە لە زهنیەتی زانا سەلەفیەکان نەقش بووە، و وەک ئەو هەڵسوکەوت دەکەن، بۆ نمونە پەیوەندی هەلپەرستانەیان لەگەڵ دەسەڵاتداران، گوێ نەدانە تەرازووی هەق و شکاندنەوە بەلای ستەمکاران... تەدلیس کردن و هەڵبەستنی تۆمەت و چیرۆکی خەیاڵی! ستایشی ستەمکاران ئەگەر پارەیان پێ بدات و ڕەخنەگرتن لێیان ئەگەر لییان بڕین، تۆمەتبارکردنی ئافرەت و سوک سەیرکردنی، عەقڵیەتی ئەفسانەئامێزی و شتی تریش!
بەڕای من تەنها ئەبو هورەیرە بەسە بۆ هەڵوەشاندنەوەی قاعیدەی عەدالەتی سەحابە لە گێڕانەوەی حەدیسەکان، و ئەو تەعدیل کردنە ومتمانە پێدانە ڕەهایە کێشەیەکی زۆری بۆ ئیسلام و قورئان و موسڵمانان دروست کردوە، بۆیە پێویستی بە پێداچوونەوەیە.

٢٠١٦/١/٣١

# معاویەی کوڕی ئەبو سوفیان

## کاریگەری معاویە وئومەویەکان بەسەر ئیسلام وموسڵماناندا

[١]

ئەمڕۆ لە غیابی کەسانی لێکۆڵەری جیدی، چەندین کەسی ساویلکە و ئاست نزم، وەک وەرگێڕیان لێهاتوە، بیری سادە ووتاری ساویلکە ونازانستی وەهابیەتی سەلەفیەت بۆ خوێنەری کوردی موسڵمان کۆپی دەکەنەوە، بەبێ کەمترین هەڵسەنگاندن ورەچاوکردنی ئاستی فەرهەنگی خەڵکی کورد!

سەیرلەوەدایە حەوسەڵە وکاتێکی زۆریان لەبەردەستدایە، بۆ وتنەوەی ئەوەی دەمێکە سواوە وهەزم وهەرس کراوە لە وڵاتانی کەنداو وبازنە سەلەفیە تەقلیدیەکان. وادەزانن ئەو زمانەی لەناو ژینگەیەکی سەرتاسەر توندرەو ویەک ئاڕاستە قبوڵی هەیە، دەکرێت لێرەش هەمان مەقبولیەت پەیدا بکات.

ڕۆژێک شەڕی مان ونەمان دەکەن دژی دیموکراتیەت، بە عەقلیەتێکی سەلەفی خەلیجی، گوایە حەڕامە وئیسلام سیستمی خۆی هەیە، کەچی لەولاوەش ستایشی معاویە ورژێمەکەی دەکات، کە لە خەلافەتی ڕاشیدیەوە گۆڕی بۆ دەوڵەتی کیسرەوی بەپێی وەسفی ئیبن عومەر وچەندین ئەسحابەی تر.

لای کەسانێک ئێستاش پاس تێپەڕبوونی هەزار وچوارسەد ساڵ، هێشتا گوناهە باسی کارە تێکدەرەکانی معاویە بکەیت! هێشتا بێویژدانی بێت ئەگەر موسڵمانان رەخنە لەو کار وکردەوانەی بگرێت، لە سەرووی هەموویانەوە گۆڕینی حوکمی شورا وڕاشدین بۆ شێوازی کیسرەویەت وهەرقەلیەتی پشتا وپشت.

ئەوە بێویژدانی نیە معاویە، لە حزوری دەیان وسەدان هاوەڵی گەورە وزانای پێغەمبەر، کوڕی خۆت بکاتە جێنشین وخەلیفە، بەسەر خیر الامة وەک سەلەفیەکان دەڵێن یان ئەڵقەی یەکەمی خیر القرون!!

ئەوە بێویژدانی نیە لە پێناو حوکمی خۆت وبنەماڵەکەت هەموو مێژووی سیاسی ئیسلام بەلاڕێدا ببەی؟!

من پێموایە ئەگەر ئەو کودەتایەی ئومەویەکان نەبا، ئێستا نمونەی حوکمڕانی ئیسلامی زۆر گەشەی کردبوو، و فیکری سیاسی ئیسلامیش لە دەرەوەی حوکمی پشتاوپشت چاکتر چەکەرەی کردبوو، نەک مێژووی سیاسی ئیسلام هێندە

قیزەون بیت، کە مرۆڤ شورەیی پێ بیت باسی بکات، تەنها باسی چەند ساڵێکی یەکەمی لیدەرچێت.
ئەو کودەتایە شومەی ئەمەویەکان بەس سیستمی سیاسی ئیسلامی بەلاڕێدا نەبرد، بەڵکو لە پێناو شەرعەیەتدان بە حوکمی ناشەرعی وکیسرەویان، ڕۆڵێکی زۆر مەترسیداریان گێڕا لە تەزویرکردنی سونە وفەرمودەکان، کە زۆرجار وەک ڕۆژی ڕوناک دەستی هەڵبەستن بە فەرمودەکانەوە دیارە، معاویە کوڕی ئەبوسوفیان بۆ من وەک لیکۆلەریک، هیچ ڕۆژێک ئەو گرنگی وبایەخەی لەلامدا نەبوە تا بە خراپی یان بە باشی باسی بکەم، ڕاستە ڕۆڵێکی زۆر ترسناکی گێڕا لە تەشویهکردنی مێژووی سیاسی ودینی ئیسلام، بەڵام هەر چارەسەر لەوە نابینم شەو ورۆژ دانیشین شیعە ئاسا بەر جوێن ونەفرەتی دەین، بەڵکو زۆرجار ڕەخنەم لە خەڵکانێک گرتوە و ئاگادارم کردونەتەوە کەوا پێویست ناکات هێندە خۆتان بە قسە پێوتن بە کەسێکی وا خەریک بکەن.
یەک لەو ڕەخنانەی لە د. عدنان ابراهیم کە هەمە، ئەوەیە پێویستی نەدەکرد ئەو هەموو ئەڵقە وتارە تەرخان بکات بۆ معاویە کوڕی ئەبوسوفیان، کە بەڕای من هەمووی بای ئەڵقەیەکە ودەکریت ببڕێتەوە. بەڵام وادیارە ئەوە مانای ئەوە نیە ڕەخنەیان لی نەگرین، کەسێکی وەک معاویە شایانی ڕەخنە و لێکۆڵینەوەی زۆرە، چونکە ئەو کەسێکە کە ئەو ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە دواخستنی سیستمی سیاسی ئیسلام، وڕەگداکوتانی ئیستبداد، وخۆسەپاندن بەسەر ئومەت وچاو سورکردنەوە لە سەحابەکان، وەک لە بوخاری وموسلیمدا هاتوە، چۆن پەلار لە ابن عمر وباوکی، عومەری کوڕی خەتاب دەدات ودەڵێت من ویەزید لە عومەر وکوڕی عومەریش شایانترین بە حوکم وەرگرتن!
ناکرێت لەکاتی بەخۆداچونەوە وڕەخنەگرتن لە ڕابڕدوو نەیەتە ناو باس، کەسانێک وادەزانن نابێت بە موتڵەقی باسی بکەین، بە بیانووی ئەوەی کاتبی وەحی بوە، کە ئەوە درۆیەکی هەڵبەستراوە وگومانی تێدا نیە بە گەواهی دەیان زانا وسەرچاوە، هەتا کاتبی وەحیش بێت، عیسمەتی پێ نادات هیچ لەسەری نەگووترێت. بێدەنگیش زۆر باش نیە، چونکە کەسانێکی دەقپەرست وبی ئاسۆی بیرکردنەوە، دێن وهەموومان بە قوربانی تۆزی ژێر پێی ئەسپی معاویە دەکەن، ودەیان وسەدان فەزائیلی ساختەی دەدەنە پاڵ، کە تەنها بە هەڕەشەی قیامەت ودۆزەخ خەلکێکی سادە وڕەشۆکی دەهێننە ژێرباری باوەڕ هێنان بەو لۆژیکە

خواروخێچـەی!

هـەر لـە کۆنـەوە خەڵکانێـک زیادەڕۆیـان کـردوە لـە وەسـف وستایشـی معاویـە، تـاڕادەی ئـەوەی پێیـان وایـە ئیسـلام بـی معاویـە بـۆی نەدەچـوە سـەر! کەسـانیکی تریـش تـا سەرئێسـقان قسـەیان پێگوتـوە وتانەیـان لێداوە تـاڕادی تەکفیـر کردنـی وەک الذهبـی دەڵێـت:

«خەڵکیکـی زۆر پشـتگیری لـە معاویـە دەکـەن، وخۆشـیان دەوێـت وزیادەڕۆیـی دەکـەن لـە خۆشەویسـتیدا، وبـە پەسـنەندترینی دەزانـن، یـان دڵـی ڕاکێشـاون بـە بەخشندەیی وئارامـی وبەخشـین، یانیش لە شـام لە دایکبوون لەسـەر خۆشەویسـتی ئـەو، ومنداڵەکانیانیـش لەسـەر ئـەو بنچینەیـە پـەروەردە دەکـەن.

تیاندا کەمێک سـەحابەی تێدایە، وژمارەیەکی زۆریش لە تابعین وپیاوچاکانی تێدایە، کە لەگەڵی جەنگان لەدژی خەلکی عێراق، ولەسـەر ناسیبی بوون پەروەردە بوون، پەنا بە خوا لە هـەواو هەوەست، وەک چۆن سـوپای عەلی [رض] ورەعیەتەکەی – خەواریجی لێدەرچێت – لەسـەر خۆشەویستی وڕابوون لەگەڵیدا پەروەردە بوون، لەسـەر بوغزاندنی وتەبەراکردن لەوانـەی ستەمیان لێکرد پێگەیشتوون، وخەڵکانێک لەوانە زیادەڕۆییان کرد لە تەشـەیوعکردندا»[1]

«هەروەها ابن الجوزی لەو بارەیەوە دەڵێت: کەسـانێکی کە ئیدئعای سـونی بوون دەکـەن بـە دەمارگـرژی حەدیسـیان بـۆی هەڵبەسـت بـۆ تورەکردنـی ڕافیـزەکان، کەسـانێکیس لـە رافیـزەکان دەمارگرژیـان گـرت وحەدیسـانێکیان دانـا لـە زەمکردنـی، هەردوولایـەن لەسـەر غەڵەتێکـی دزێـون»[2]

لـە فتح البـاري شـرح صحيـح البخـاري دا هاتـوە، کە لـە ڕێگای ابن الجوزی لـە عبدالله

---

١ - «وخلـف معاويـة خلـق كثيـر يحبونـه ويتغالـون فيـه ويفضلونـه، إمـا قد ملكهـم بالكـرم والحلـم والعطـاء، وإمـا قد ولـدوا فـي الشـام علـى حبـه، وتربـى أولادهـم علـى ذلـك. وفيهـم جماعـة يسيرة مـن الصحابـة، وعـدد كثيـر مـن التابعيـن والفضـلاء، وحاربـوا معـه أهـل العـراق، ونشـؤوا علـى النصـب، نعـوذ بـالله مـن الهـوى، كمـا قـد نشـأ جيـش علـي رضـي الله عنـه، ورعيتـه - إلا الخـوارج منهـم - علـى حبـه والقيـام معـه، وبغـض مـن بغـى عليـه والتبـري منهـم، وغـلا خلـق منهـم فـي التشيع «.

سير أعلام النبلاء, الذهبي (١٢٨/٣).

٢ - يقـول ابـن الجـوزي: «قـد تعصـب قـوم ممـن يدعـى السـنة فوضعـوا فـي فضلـه أحاديـث ليغضبـوا الرافضـة وتعصـب قـوم مـن الرافضـة فوضعـوا فـي ذمـه أحاديـث، وكلا الفريقيـن علـى الخطـأ القبيح". الموضوعـات, ابـن الجـوزي (٢٤٩/٢).

بن احمن بن حنبل دەریهێناوە، کە ئەو فەزائیلانەی دەیدەنە پاڵ معاویە بە ڕای امام احمد بن حنبل ڕاست نین لە ڕووی سەنەدەوە، بەڵکو دروستکراوە لەلایەن دوژمنانی حەزرەتی عەلی، کە چەند گەران عەیبێکیان لیی نەدۆزیەوە، لە ڕقی ئەو بە سەر معاویەیان هەڵگووت، هەروەها حەدیسێکی زۆر لە فەزائیلی معاویە گێڕدراوەتەوە بەڵام هیچیان لە ڕووی سەنەدەوە ڕاست نین، اسحاق بن راهویە والنسائي وغەیری ئەوانیش دڵنیان لەوبارەوە. « وأخرج ابن الجوزي أيضا من طريق عبد الله بن أحمد بن حنبل :سألت أبي ما تقول في علي ومعاوية ؟ فأطرق ثم قال : اعلم أن عليا كان كثير الأعداء ففتش أعداؤه له عيبا فلم يجدوا، فعمدوا إلى رجل قد حاربه فأطروه كيادا منهم لعلي ، فأشار بهذا إلى ما اختلقوه لمعاوية من الفضائل مما لا أصل له. وقد ورد في فضائل معاوية أحاديث كثيرة لكن ليس فيها ما يصح من طريق الإسناد، وبذلك جزم إسحاق ابن راهويه والنسائي وغيرهما، والله أعلم . » [٣].

## [٢]
## فەزائیلەکانی معاویە

سەرەڕای کاتیبیەتی وەحی وموسڵمانبوونی بەر لە فەتحی مەکە، نوسەرانی مەشرەب سەلەفی دەیان فەزائیلی تر نەقل دەکەن لە کتێبە تەقلیدیەکان ئەوانەی هەتا قسە نەرێنیەکانیشی بۆ بە باش لێکدەدەنەوە. ئینجا چیرۆکی موسڵمان بوونی بەر لە فەتحی مەککەش ثابت نیە، وئەویش لەو شتە هەڵبەستراوانەیە کە بۆیان دروست کردوە. بەڕای من هەتا مەسەلەی کاتبی وەحی بوونیش ئەگەر گریمان ڕاست بێتیش هەر فەزیلەیەک نیە لە خودی خۆیدا، چونکە دوو نمونەی هەڵگەڕاوەمان هەیە لە نوسەرانی وەحی وەک عبد الله بن سعد بن أبي سرح کە لە سەردەمی مەکەدا، بەڵکو یەکەمین کاتبی وەحی بوە لە ساڵانی یەکەمی نێردەی پێغەمبەردا. کەچی هەڵگەڕایەوە بە جۆرێک کاتێ پێغەمبەر فەتحی مەککەی کرد

---

٣ فتح الباري شرح صحيح البخاري، أحمد بن علي بن حجر العسقلاني، دارالريان للتراث، سنة النشر: ١٤٠٧هـ / ١٩٨٦م
http://library.islamweb.net/newlibrary/display_book.php?bk_no=52&ID=2135&idfrom=6834&idto=6838&bookid=52&startno=2

تەنها لە عبداللە بن سعد خۆش نەبوو لەگەڵ دووسێ پیاو ژنی تر!
نمونەی دوەمیش بوخاری وموسلیم باسی دەکات کابرایەکی مەسیحی گوایە دەبیتە موسڵمان ووەحی دەنوسێتەوە، کەچی دوایی هەڵدەگەڕێتەوە ودەبێتەوە مەسیحی، ودەڵێت من بە هەوەستی خۆم ئەوەی محمد پێی دەوتم دەمگۆڕی ودەستکاریم دەکرد![4]
دەڵێ بەڵام معاویە هەڵنەگەڕاوە، دەڵێین ڕاستە بەڵام هەڵگەڕابایەوە هەر هێندەی ئەو دوو کاتیبەی وەحیانەی کە هەڵگەڕانەوە زیانی دەبوو، نەک ئەو زیانەی کە تا ئێستا میژوو وئومەتی ئیسلامی تاڵاوی دەچێژن.
زیادەڕۆی لە معاویە لە هەردوو سەر دەکرێت، کەسانیک هێندەی دەشکینن تا دەگاتە کوفر ونیفاق، کەسانێکی تریش هێندە نا لۆژیکانە بە شانو باڵی داهەڵدەدەن هەتا ئەو شتانەی بە خراپیش دەشکیتەوە بەسەر معاویە، ئەوان بە فەزائیلی لە قەڵەم دەدەن، بۆ نمونە حەدیسی [لا أشبع الله بطنه ] رواه مسلم[5]
کە النسائي کاتێک پرسیاریان لێکرد باسی فەزائیلی معاویە بکات، گووتی فەزائیڵی چی، باسی [لا أشبع الله بطنه ] بکەم!؟ معاویە بەس نیە سەر بە سەر لیی دەرچێت، تا باسی فەزائیلی بکرێت؟!! لەسەر ئەوەش هەوادارانی معاویە لە شامیەکان هێندەیان لیدا بە تایبەتی لە شوێنی هەستیاری تا بە هۆیەوە کۆچی دوایی کرد، هەر ئەو هەوادارانەی معاویە تۆمەتی مەیلداری بۆ شیعایەتیان داوەتە پاڵ، کەچی ابن کثیر لە [البداية والنهاية] پاش گێڕانەوەی ئەو ڕوداوە دەڵێت: ابن یونس دەڵێت: النسائی ئیمام بوو لە حەدیس وسیقە وحافز بوو...
الدارقطنی یش دەڵێت: فەقیهترین زانای میسر بوو لە سەردەمی خۆیدا، وزاناترینیانە بە حەدیسی ڕاست لە عیللەتدار وزاناترینیان بوو بە پیاوان، کە گەیشتە ئەو پایەیە ئێرەییان پیی برد،،،

---

٤ - قال سليمان بن المغيرة ، عن ثابت ، عن أنس قال : كان منا رجل من بني النجار قد قرأ البقرة، وآل عمران، وكان يكتب لرسول الله صلى الله عليه وسلم، فانطلق هاربا حتى لحق بأهل الكتاب، قال : فرفعوه، قالوا : هذا كان يكتب لمحمد ، فأعجبوا به، فما لبث أن قصم الله عنقه فيهم، فحفروا له فواروه، فأصبحت الأرض قد نبذته على وجهها، ثم عادوا فحفروا له فواروه، فأصبحت الأرض قد نبذته على وجهها، فتركوه منبوذا . رواه مسلم .

٥ - عن بن عباس قال كنت ألعب مع الصبيان فجاء رسول الله e فتواريت خلف باب قال فجاء فحطأني حطأة وقال اذهب وادع لي معاوية قال فجئت فقلت هو يأكل قال ثم قال لي اذهب فادع لي معاوية قال فجئت فقلت هو يأكل فقال لا أشبع الله بطنه» (رواه مسلم

إبن قيم الجوزية لە كتێبی نقد المنقول – الجزء : ( ١ ) – رقم الصفحة : ( ١٠٦)
دەڵێت:
قال إسحاق بن راهويه : لا يصح في فضائل معاوية بن أبي سفيان، عن النبي (ص) شيء!
العيني لە (عمدة القاري في شرح البخاري) دەربارەی ئەو بەشەی بوخاری كە ناوی ناوە (باب ذكر معاوية) نەک (باب فضائل معاوية):
فإن قلت: قد ورد في فضله أحاديث كثيرة. قلت نعم, ولكن ليس فيها حديث يصح من طريق الاسناد, نصَّ عليه إسحاق بن راهوية والنسائي وغيرهما فلذلك قال (البخاري): باب ذكر معاوية ولم يقل فضيلة ولا منقبة!
ئەگەر دەپرسیت حەدیسێكی زۆر هاتوە لە چاكەكانی؟ دەڵێم بەڵێ، بەڵام هیچ حەدیسێكیان ڕاست نین لە ڕێگای سەنەدەكانیانەوە، ئەوە دەقی وتەی ئیسحاق بن راهویە والنسائی وغەیری ئەوانیش وادەڵێن، ئیسحاق بن راهویه [كە مامۆستای بوخاری وموسلیمە] دەڵێت: هیچ حەدیسێكی سەحیح لە پێغەمبەرەوە نیە دەربارەی معاویە!! [٦]

٦ - إبن كثير - البداية والنهاية - سنة ثلاث وثلاثمائة - من توفي فيها من الأعيان - الجزء : ( ١٤ ) - رقم الصفحة : ( ٧٩٤)
- وقال إبن يونس : كان النسائي إماماً في الحديث ثقة ثبتاً حافظاً، كان خروجه من مصر في سنة ثنتين وثلاثمائة.
- وقال إبن عدي : سمعت منصوراً الفقيه وأحمد بن محمد بن سلامة الطحاوي يقولان : أبو عبد الرحمن النسائي إمام من أئمة المسلمين، وكذلك أثنى عليه غير واحد من الأئمة وشهدوا له بالفضل والتقدم في هذا الشأن، وقد ولي الحكم بمدينة حمص.
- سمعته من شيخنا المزي، عن رواية الطبراني في معجمه الأوسط حيث قال :، حدثنا : أحمد بن شعيب الحاكم بحمص. وذكروا أنه كان له من النساء أربع نسوة، وكان في غاية الحسن، وجهه كأنه قنديل، وكان يأكل في كل يوم ديكاً ويشرب عليه نقيع الزبيب الحلال، وقد قيل عنه : إنه كان ينسب إليه شئ من التشيع قالوا : ودخل إلى دمشق فسلهها : إن يحدثهم بشئ من فضائل معاوية فقال : أما يكفي معاوية أن يذهب رأساً برأس حتى يروى له فضائل ؟ فقاموا إليه فجعلوا يطعنون في خصيتيه حتى أخرج من المسجد الجامع، فسار من عندهم إلى مكة فمات بها في هذه السنة، وقبره بها هكذا حكاه الحاكم، عن محمد بن إسحاق الإصبهاني، عن مشايخه.

